

وەزارەتی مافی مرۆڤ
بەڕێوەبەرایەتی مافی مرۆڤی سلێمانی
چاپکراوی ژمارە (22)

# پۆلیس و یاسا و مافەکانی مرۆڤ



وەرگێڕان و ئامادەکردنی
سابیر عەبدوڵڵا کەریم

کوردستان - هەولێر
2009

وەزارەتی مافی مرۆڤ
بەڕێوەبەرایەتی مافی مرۆڤی سلێمانی
چاپکراوی ژمارە (٢٢)

# پۆلیس و یاسا و مافەکانی مرۆڤ

وەرگێڕان و ئامادەکردنی
سابیر عەبدوڵڵا کەریم

هاوکاران
نور خالد جەعفەر    بەناز حسن عبدالله
ئالان محەمەد رەسول    هەڵشۆ عبدالفتاح

کوردستان - هەولێر
٢٠٠٩




**وەزارەتی مافی مرۆڤ**

**بەڕێوەبەرایەتی مافی مرۆڤی سلێمانی**

ناوی کتێب: پۆلیس و یاسا و مافەکانی مـرۆڤ

وەرگێرانی: سابیر عەبدوڵلا کەریم

نەخشەسازی ناوەوەو بەرگ: یەعقوب قادر پیرۆت

تایپ: هەڵشۆ عبدالفتاح

هەڵەچن: حوسێن ئەحمەد

تیراژ: ١٥٠٠ دانە

چاپخانە: چاپخانەی وەزرارەتی رۆشنبیری

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ ژمارەی سپاردنی (٤٦١) ساڵی (٢٠٠٩)ی پێدراوە

لە زنجیرە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی مافی مرۆڤ ژمارە (٢٢)

# پێرست

# پێشەکی

زۆرجار بەرگوێمان دەکەوێت کە دەڵێن"پۆلیس لە خزمەتی گەلدایە"، ئەمە لێکدانەوەیەکی دروستە، لە راستیشدا ئەرکی پۆلیس هەر ئەوەیە. بە واتایەکی روونتر دەکرێت بڵێین دامودەزگاکانی پۆلیس وەك لایەنی جێبەجێکاری یاسا ئەرکیان پاراستنی ئارامی و سەروسامانی هاوڵاتیانە، لەو پێناوەشدا دەبێت یەکە یەکە یەکەی کارمەندانی پۆلیس لەکاتی جێبەجێکردنی ئەو ئەرك و کاروبارانەدا کە لە چوارچێوەی یاسا پەیڕەوکراوەکاندا پێیان سپێدراوە رەچاوی سەرجەم پێوەرو بنەماکانی مافی مرۆڤ بکەن و خۆیان لە پێشێلکردن و بازدان بەسەر ئەو مافانەدا بپارێزن، بەڵکو بەپێچەوانەوە پێویستە دامودەزگاکانی پۆلیس پێشەنگی کۆمەڵگە بن و هەمیشە رێگربن لەبەردەم پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ لەلایەن هەرکەس ولایەکەوە بێت، چونکە دروستبوونی هەڕەشە بۆ سەربەرزی و پیرۆزی مافەکانی مرۆڤ وردە وردە کۆمەڵ بەرەو نائارامی و هەڵدێر دەبات و ناسەقامگیری دەکات. لە سیستمە دیموکراسی

و لیبرالیەکاندا دەزگاکانی پۆلیس وەك کاراکتەرێکی یاسایی و مرۆڤدۆست یاساو رێساکان جێبەجێ دەکەن وکۆمەڵ لە تاوانکاری و پێشێلکاری و لادان دەپارێزن و یەکسانی لەبەردەم یاسادا بەرجەستە دەکەن. بەڵام لە سیستمە دیکتاتۆری و شمولییەکاندا دەزگای پۆلیس ناشرین و نابوت خۆی دەناسێنێت و دەبێتە دێوەزمەو داپلۆسێەر بەسەر کۆمەڵگاوە، بۆیە نەك هەر رێگری لە پێشێلکاری و تاوانەکان پێناکرێت، بەڵکو لەبەرامبەردا خۆی دەبێتە ئامرازێك بۆ پێشێلکاری و هەڕەشە بۆ سەر کۆمەڵگەو لە یاسا لادەدات، چونکە سیستمە دیکتاتۆری و عەسکەرتاریەکان خۆیان دەزگاکانی پۆلیس دەکەنە ناوەندێکی داپلۆسێنەرو بەرگێکی ناشایستە و ناهەمواری بەبەردا دەکەن.

لە دووتوێی ئەم بەرهەمە بچووکەدا، کە تایبەتە بە پابەندبوونی دامودەزگاکانی پۆلیس و سەرجەم کارمەندانی راسپێردراو بە جێبەجێکردنی یاساکان و تاوەکو ئێستا وەك پێویست شتێکی ئەوتۆی لەبارەوە باس نەکراوە و نەنووسراوە، ئێمە هەوڵمانداوە کەمێك بە وردی باس لەو پێوەر و بنەما یاساییە ناوخۆیی و نێودەوڵەتیانە بکەین کە وەك سنوورێکی دیاریکراو قابیلی بەزاندن و بایکۆتکردن نین و دانراون بۆ ئەوەی هێڵێکی ورد و

درشـت بـۆ دەزگاكـانی پـۆلیس و پـارێزەرانی یاسـا دابنـێن كـە دەسەڵات و ئەركەكانیان تا چەند و تا كوێیە و چی باشە بیكـەن وچی باش نییە بیكەن بەپێی ئەركی پیشەییان.

لە بەشی یەكەمی ئەم بەرهەمەدا باسی (ڕەفتاری ئـەخلاقی و یاسـایی پـۆلیس و پێـوەرە نێودەوڵەتیانـەكانی تایبـەت بـە ڕەفتاری ئەخلاقی و یاسـایی دامودەزگاكـانی پـۆلیس وسـنووری بەكارهێنانی هێز لە لایەن پـۆلیس و لێپرسـراوێتی تاكـە كەسـیی پـۆلیس و بنـەماكانی ڕێگـەگرتن لـە لەسـێدارەدان لـە دەرەوەی یاسـا و لەسـێدارەدانی بـێ دادگـایی) دەكـەین، چـونكە تـەواوی مافەكانی مرۆڤ لە ڕەسەنایەتی و مۆركی مرۆڤایـەتی تاكەكانـەوە هەڵـدەقوڵێت، بۆیـە پێویـستە لەسـەر ئەوكارمەندانـەی یاسـا جێبەجێدەكەن لە هەمووكاتێكدا گوێرایەڵی یاساكان بن و ڕێزیان لێبگیرێن، هەروەك پێویستیشە لەسەریان كە بە ڕێكـوپێكی ئـەو ئەركانـە جێبەجێبكـەن كـە یاسـا خـستویەتیە سەرئەسـتۆیان، ئەمـەش لـە ڕێگـەی خزمـەتكردنی كومـەڵگا و پاراسـتنی هـەموو كەسەكان لە هەموو كارە ناسـاییەكان دەبێـت، بـەڵام بەمـەرجێ لەگـەڵ پلــە وپایــەی پیــشەیی و لێپرســراوێتیاندا بگونجێــت. هــەروەك نابێــت ئــەو فەرمانبەرانــەی یاســا جێبەجێدەكــەن

(دادوەران، کارمەندانی یاسایی، پۆلیس، ئاسایش)هیچ کارێك ئەنجام بدەن کە ئەرکەکانی سەرئەستۆیان لەکەدار بکات و پێویستیشە لەسەریان بەگژ هەموو ئەو کاروکردەوانەدا بچنەوە کە نایاساییین و زۆر بەتوندی کاربکەن بۆ قەڵاچوکردنیان.

لە بەشی دووەمیشدا باسی (لەسێدارەدان لە دەرەوەی یاسا و لەسێدارەدانی بێ دادگایی و ئەرکی پۆلیس لە ئاگادارکردنەوەی پێشێلکارییەکان و پێوەرە نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بە جیاوازینەکردن و مافی یەکسانی لەبەردەم یاسادا و بەکارهێنانی هێز و لێپرسراوێتی تاکەکەسیی پۆلیس) خراوەتەڕوو، چونکە بناغەی مافەکانی مرۆڤ بەندە لەسەر ڕێزگرتنی کەرامەتی ڕەسەنایەتی مرۆڤ و سەرجەمی ئەم مافانەش بواری دەستکاریکردنیان بۆ نییە، بۆیە نابێت بە هیچ شێوەیەك مافەکانی هیچ کەسێك زەوت بکرێت، لەوەش گرنگتر مافەکانی مرۆڤ لە لایەن یاسا نێودەوڵەتی و ناوخۆییە کارپێکراوەکانی ناو خودی دەوڵەتانەوە دەپارێزرێت. بەو پێیەش فەرمانبەران وکارمەندانی پۆلیس بەرپرسیارن لە جێبەجیکردنی یاساکان، بۆیە دەبێت گوێڕایەڵی یاسابن، بەو یاسایەنەشەوە کە لە پێناوی پاراستن و بەهێزکردنی مافەکانی

مرۆڤـدا دارێـژراون و ئـەو یاسـا و رێـسا مرۆییانـە رێـچکەیان لێوەرگرتوە،کە بێگومان هەمیشە داکۆکیکردن لە مافەکانی مرۆڤ و رێزگرتنە لە کایە و کەرامەتی مرۆڤەیایەتی.

لـە بەشـی سـێیەمدا باسـی( ئـەرك و لایەنەگـشتییەکانی کارکردنی پۆلیس لە سیستمە دیموکراسییەکاندا و سەرچاوە و سیـستم و پێوەرەکـانی مـافی مـرۆڤ لـە بەجێگەیانـدنی یاسـا و مامەڵەکردنی بەنـدکراوان و بنـەما سـەرەکییەکانی دادپـەروەری تایبـەت بـە قوربانیـانی تـاوان ورێکەوتننامـە و پێـوەرە نێودەوڵەتییەکان)کراوە.

لـە بەشـی چـوارەمداکە دوابەشـی ئـەم بەرهەمەیـە، باسـی (جیاکاری ئاینی و جیاکاری لـە بەرامبـەر ئافرەتـان و منـداڵان و میکـانیزمی لێکۆلینـەوەکانی پـۆلیس و لایەنـە تەکنیکیـەکانی لێکۆڵینـەوەکان و بـەرێوەبردنی هەواڵـدەرە نهێنییـەکان ودەسـەڵاتی پـۆلیس لـە دەسـتگیرکردندا)کـراوە کـە لایـەنێکی گرنگی ئەم شیکارە پێکدەهێنێت. بەگشتی سەرجەمی ئەو یاسا و بنـەما نێودەوڵەتیانـەی دارێـژراون بـۆ بەرێوەچـوونی کـاری دەزگاکانی پۆلیس بە شـێوەیەکی دادوەرانـە، زۆر گرنگـە وەکـو خۆیان جێبەجیبکرێن. بۆیە دەکرێت بڵێین کـە دەسـتەبەرکردنی

کاریگـەری کـاری پـۆلیس سـەلیقە و توانایـەکی پیـشەیی و تەکنیکی زۆری پێویستە، بەڵام ئاستی تواناکان هەرچەندێك بێت کاریگەری رەهای کارەکانی پۆلیس بـەبێ پـشتیوانی و هاوکـاری هاوڵاتیان بەدینایەت.

بەپێی پێویست هەوڵمانداوە بابەتێکی نوێ پێشکەش بکـەین کە بەکەمی ورووژێنراوە و باسی لێوەکراوە، ئەمە لە کاتێکدایەکـە سەرجەم دامودەزگاکانی پۆلیس بە هەموو پلـە و مەراتبـەکانیان وکارمەندانیانـەوە پێویـستە هۆشـیاری و زانیـاری تـەواویان لـەبارەی یەکـە یەکـەی ئـەو بنـەماو پێوەرومـەودا یاسـاییەی کـارکردنی رۆژانەیانـەوە هـەبێت کـە لـەم شـیکارەدا بـە وری ئاماژەیان بۆکراوە.

سابیر عەبدوڵڵا کریم

## تەوەری یەکەم

# پێوەرە نێودەوڵەتییەکانی
# ڕەفتاری ئەخلاقی و یاسایی پۆلیس

تەواوی مافەکانی مرۆڤ لە ڕەسەنایەتی و مۆرکی مرۆڤایەتی تاکەکانەوە هەڵدەقوڵێت، بۆیە پێویستە لەسەر ئەو کارمەندانەی یاسا جێبەجێدەکەن لە هەموو کاتێکدا گوێڕایەڵی یاساکان بن و ڕێزیان لیبگیرێت، هەروەك پێویستیشە لەسەریان بە ڕێکوپێکی ئەو ئەرکانە جێبەجێبکەن کە یاسا خستویەتی سەر ئەستۆیان، ئەمەش لە ڕێگەی خزمەتکردنی کۆمەڵگا و پاراستنی هەموو کەسەکان لە هەموو کارە ناسایەکان دەبێت، بەڵام بەمەرجێ لەگەڵ پلە وپایەی پیشەیی و لێپرسراوێتیاندا بگونجێت. نابێت ئەو فەرمانبەرانەی یاسا جێبەجیدەکەن هیچ کارێك ئەنجام بدەن کە ئەرکەکانی سەرئەستۆیان لەکەدار بکات و پێویستیشە لەسەریان بەگژ هەموو ئەو کارو کردەوانەدا بچنەوە کە نایاساین و زۆر بەتوندی کاربکەن بۆ قەڵاچۆکردنیان. دەبێت ئەو کارمەند و فەرمانبەرانەی ڕاسپێردراون بە جێبەجیکردنی

یاساکان، ڕێز لە کەرامەتیان بگرن و پارێزگارییان لێبکەن، هەروەك لەسەریانە پارێزگاری لە مافەکانی هەموو مرۆڤەکان بکەن و ڕێگە نەدەن لەکەدار بکرێن و ئەرکی ئەوانیشە لایەنە پەیوەندیدارەکان ئاگادار بکەنەوە لە هەر پێشێلکاری و بازدانێك بەسەر ئەو یاسا و ڕێساو بنەمایانەدا کە مافەکانی مرۆڤ دەپارێزن و لە پێشێلکردن دووریان دەخەنەوە.

لە هەموو ڕێوشوێن و کاروبارەکانی پۆلیسدا دادپەروەری و جیاوازی نەکردن و گونجاندن و ڕیتمی مرۆڤایەتی پەیڕەو دەکرێت.

١- پێوەرە نێودەوڵەتیەکانی مافەکانی مرۆڤ کە پەیوەندیدارن بە جێبەجیکردنی یاساکان و بناغەیەکی تەندروست پێکدەهێنێت بۆ چونێتی ڕفتارکردنی هێزەکانی پۆلیس بە شیوەیەکی یاسایی و ئەخلاقی، بەڵام هەندێك لەم پێوەرانە ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە ڕەفتاری ئەخلاقی کاری پۆلیسەوە هەیە و هەندێکی تریشیان چەند کێشیەکی ئەخلاقی بۆ دەزگاکان و کارمەندانی جێبەجێکردنی یاساکان دروست دەکەن.

٢- بناغەی مافەکانی مرۆڤ بەندە لەسەر ڕێزگرتنی کەرامەتی ڕەسەنایەتی مرۆڤ و سەرجەمی ئەم مافانەش بواری دەستکاریکردنیان بۆ نییە، بۆیە نابێت بە هیچ شێوەیەك مافەکانی هیچ کەسێك زەوت بکرێت، لەوەش گرنگتر مافەکانی مرۆڤ لە لایەن یاسا نێودەوڵەتی و ناوخۆییە کارپێکراوەکانی ناو خودی دەوڵەتانەوە دەپارێزرێت.

٣- بەو پێیەی فەرمانبەران و کارمەندانی پۆلیس بەرپرسیارن لە جێبەجیکردنی یاسا، بۆیە دەبێت گوێڕایەڵی یاسابن، بەو یاسایەنەشەوە کە لە پێناوی پاراستن و بەهێزکردنی مافەکانی مرۆڤدا داڕێژراوە، بۆیە لە ئەنجامدا دەزگاکانی پۆلیس دەبێت ڕێز لەو بنەما سەرەکیانە بگرن کە ئەو یاسایانە ڕێچکەیان لێوەرگرتوە کە بێگومان هەمیشە داکۆکیکردن لە مافەکانی مرۆڤ و ڕێزگرتنە لە کایە و کەرامەتی مرۆڤایەتی.

٤- ئەو بناغەیەی کە ڕەفتاری ئەخلاقی و یاسایی پۆلیس لەسەری بەندە، بریتیە لە ڕێزگرتنی یاساکان و کەرامەتی مرۆڤایەتی لە ڕێگەی ئەوانیشەوە ڕێز لە مافەکانی مرۆڤ دەگیرێت .

بەگشتی ئەرکی جێبەجێکردنی یاساکان و پاراستنی بارودۆخی گشتی لەم (٣) بنەمایەی خوارەوە خۆیان دەبیننەوە:

- ڕێزگرتن و گوێرایەڵی کردنی یاساکان.
- ڕێزگرتن لە کەرامەتی مرۆڤایەتی.
- ڕێزگرتن و پارێزگاریکردن لە مافەکانی مرۆڤ بە گشتی.

## تەوەری دووەم

# حوکمە دیاریکراوەکانی کە پەیوەندییان بە ڕەفتاری ئەخلاقی و یاسایی کاری پۆلیسەوە هەیە

أ. بەگشتی ئەو بنەمایانەی باسیان لێوەکرا، هەردوو ماددەی (٨،٢) لە ڕێسای بنەماکانی ڕەفتاری کارمەندانی ڕاسپێردراو بە جێبەجیکردنی یاساکان ئاماژەیان بۆ کردووە. کاتێك کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بەپێی بڕیاری (٣٤-١٦٩) لە (١٧) کانونی یەکەمی (١٩٧٩)دا ئەم ڕێسایەی پەسندکرد، لە هەمان کاتیشدا دانی ناوە بەو ئەرکە گرنگەی کە دەکەوێتە ئەستۆی کارمەندانی ڕاسپێردراو بە جێبەجێکردنی یاساکان و ڕێزگرتنیان لەکەرامەتی مرۆڤایەتی و بنەماکانی مافی مرۆڤ، هەروەك هانی ئەوەشدەدات کە ئەو پێوەرانەی لەو ڕێسایەدا باسکراون ببنە بەشێك لە بیروباوەڕی هەموو یەکێك لەو فەرمانبەر و کارمەندانەی ئەرکییان جێبەجیکردنی یاسایە، ئەویش لە ڕێگەی ڕاهێنان و هۆشیارکردنەوەیانەوە.

ب. یاسای بنەماکانی رەفتارکردنی جێبەجێکارانی یاسا کە (٨) ماددە لە خۆدەگرێت بەم شێوەیەی خوارەوە:

ماددەی (١) :- پێویستە لەسەر کارمەندانی راسپێردراو بە جێبەجیکردنی یاسا و سەرجەم ئەو ئەرکانەی راپرسی ئەستۆیان کراوە جێبەجێیان بکەن، ناوەڕوکی ئەم ماددەیەش هەموو فەرمانبەران و کارمەندانی بەرپرس لە جێبەجیکردنی یاسا دەگرێتەوە، واتە ئەوانەی کە دەسەڵاتەکانی پۆلیس جێبەجیدەکەن، بە تایبەتیش دەسەڵاتی دەستگیرکردن و دەستبەسەرکردن و گلدانەوە.

ماددەی (٢):- دەبێت کارمەندانی راسپێردراو بەجێبەجێکردنی یاسا لە کاتی هەستانیان بە ئەرکەکانیان رێز لە کەرامەتی مرۆڤایەتی کەسەکان بگرن و پارێزگاری لێبکەن، ئەمجۆرە رەفتارەش بۆ هەموو مرۆڤەکانە بەبێ جیاوازی.

ماددەی(٣):- رێگە نادرێت بە کارمەندانی راسپێردراو بە جێبەجیکردنی یاسا هێز بەکاربهێنن، تەنها لەکاتی زۆر پێویستدا نەبێت، واتە لەو سنوورەدا کە راییکردنی ئەرکەکەیان وادەخوازێت.

ماددەی (٤):- پێویستە کارمەندانی راسپێردراو بە جێبەجێکردنی یاسا ئەو نهێنیانە بپارێزن دەربارەی چەند مەسەلەیەکی بەردەستیان کە پێویستە پارێزگاری لە نهێنیان بکرێت، چونکە ئەو کارە دەچێتە خانەی دادپەروەری و چواچێوەی جێبەجێکردنی کارەکانیان.

ماددەی (٥):- قەدەغەکردنی ئەشکەنجەدان و جۆرەکانی تری خراپ مامەڵەکردن بەشێوەیەکی رەها، هەروەك رێگەش نادرێت بە هیچ کامێك لە فەرمانبەران و کارمەندانی جێبەجێکاری یاساکان کە فەرمانێکی سەروی خۆیان بکەنە پاساو بۆ ئەشکەنجەدانی کەسەکان، بەتایبەتی لە بارووددۆخی شەڕدا، یاخود لە کاتی بوونی مەترسی لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی.

ماددەی (٦):- پێویستە کارمەندانی راسپێردراو بە جێبەجێکردنی یاسا شەونخونی بکەن بۆ دابینکردنی پارێزگاری تەواو لە ژیانی ئەو کەسانەی کە لە ئەستۆیاندان.

ماددەی (٧) :- پێویستە کارمەندانی راسپێردراو بە جێبەجێکردنی یاسا دوور بکەونەوە لە ئەنجامدانی هەر کارێك کە

ببێتەمایەی خراپکردنی ئەستۆپاکیان یان لەکەدارکردنی کەسێتیان.

ماددەی (٨):- پێویستە لەسەر کارمەندانی راسپێردراو بە جێبەجێکردنی یاسا رێزی بنەماکانی رەفتاری یاسایی بگرن، هەروەها لەسەریشیانە رێگەنەدەن هیچ پێشێلکارییەك رووبدات، بەڵکو بەوپەڕی بوێرییەوە رووبەڕووی پێشێلکارییەکان ببنەوە، هەروەها پێویستە لەسەریان ئاگاداری لایەنە پەیوەندیدارەکان بکەن لەبارەی ئەو پێشلکارییانەی کە روودەدەن.

شیاوی باسکردنە فەرمانە باڵاکان و بارودۆخە تایبەتییەکان کە لە ماددەی (٥)ی سەرەوەدا ئاماژەی پێکراوە لەگەڵ ئەرکی ئاگادارکردنەوە لە رووداني هەر پێشێلکارییەك کە لە ماددەی(٨)دا ئامارژەی پێکراوە، دوو مەسەلەی زۆر گرنگن لە چوارچێوەی رەفتار و هەڵسوکەوتەکانی دەزگاکانی پۆلیس. پێویستە ئەوە بوترێت کە ئەم بنەما یاساییانە بە چەند بناغەیەکی نموونەیی و شایستە دادەنرێن بۆ دارشتنی یاسا و رێسایەکی نیشتمانی لە ناوخۆی ولاتەکاندا کە تایبەت بن بە دیاریکردنی ئەرك و کارەکانی فەرمانبەرانی پۆلیس .

## تەوەری سێیەم

# رەفتارەکانی پۆلیس و بەکارهێنانی هێز

زۆر گرنگە لەم قوناغەی ئێستای مرۆڤایەتیدا کە بنەما سەرەکییەکانی تایبەت بە بەکارهێنانی هێز و چەکی ئاگرین (زیندوو) لەلایەن کارمەندانی راسپێردراو بە جێبەجیکردنی یاسا بخرێتە بەرباس و لێکۆڵینەوە، بەتایبەتیش بنەمای ژمارە (١) کە دەڵێت ( پێویستە لەسەر حکومەتەکان و دامودەزگاکانی تایبەت بە جێبەجێکردنی یاسا مەسەلەی رەفتارکردنی پەیوەندیدار بە بەکارهێنانی هێز و چەکی ئاگرین بە شێوەیەکی بەردەوام بخەنە پێشچاوی خۆیان و لێیان بێئاگا نەبن.) لە راستید ئەم کارەش پێویستی بە دانانی چەند سیستم و چوارچێوەیەکی گشتی هەیە، لەگەڵ بەرجەستەکردنی ئەنجامی مەشق و راهێنانەکان کە لە بواری تیۆری و پراکتیکی لە بواری بەکارهێنانی هێزدا رەنگ دەداتەوە.

## لێپرسراوێتی تاکەکەسیی پۆلیس

هەندێك یاسا و ڕێسای تایبەت هەن کە باس لە لێپرسراوێتی تاکەکەسیی کارمەندانی پۆلیس دەکەن لە چواچێوەی ڕەفتاری ئەخلاقی و یاسایی دەزگاکانی پۆلیسدا، بە شێوەیەکی گشتی دەکرێت بەمجۆرە بخرێنەڕوو:

١- ڕێکەوتننامەی بەگژداچوونەوەی ئەشکەنجەدان و شێوازەکانی مامەڵەکردن و سزادانی توونددو نامرۆڤانە و سوکایەتیکردن. بڕگەی(٣) لە ماددەی (٢)ی ئەم ڕێکەوتننامەیە دەڵێت " هەرگیز نابێت ئەو فەرمانانەی کە لە لایەن بەرپرسانی خاوەن دەسەڵات و پلە بەرزترەوە دەردەچن، بکرێنە یاسایەك یان پەیڕەوێك بۆ ئەشکەنجەدانی مرۆڤەکان". ئەم حوکمە یاساییە بەسەر هەموو کارمەندان و فەرمانبەرانی گشتی یان هەر کەسێك کە بە سیفەتێکی ڕەسمی کاردەکات جێبەجێدەکرێت، بەم پێیەش بەسەر هەموو کارمەندانی پۆلیسدا جێبەجیدەکرێن، بەڵام بە مەرجێك یاسای بنەماکانی ڕەفتاری کارمەندانی ڕاسپێردراو بە جێبەجێکردنی یاساکان کە پێشتر ئاماژەمان پێکرد، حوکمێکی هاوشێوە بگرێتەخۆ .

٢- ماددەی(٥) لە تۆماری بنەماکانی ڕەفتارکردنی کارمەندانی جێبەجێکاری یاسا دووبارە تەئکید لەسەر

قەدەغەکردنی ئەشکەنجەدان دەکاتەوە، واتا هیچ کەسێك لە کارمەندانی راسپێردراو بە جێبەجێکردنی یاساکان بۆی نیە فەرمانێکی سەرووی خۆی بە پاساو بێنێتەوە بۆ پەیڕەوکردن، یان بەکارهێنانی ئەشکەنجەدان دژی مرۆڤەکان.

## بنەما سەرەکییەکانی تایبەت بە بەکارهێنانی چەك لەلایەن پۆلیسەوە

ئەم بنەمایانە سێ رەگەزی سەرەکی دەگرنەخۆ کە ئاماژە دەکەن بۆ لێپرسراوێتی تاکەکەسی لە دەزگاکانی پۆلیسدا بەمشێوەیەی لای خوارەوە:-

أ- دەبێت حکومەتەکان و دامودەزگاکانی جێبەجێکردنی یاساکان ئەگەر هاتوو ئاگاداری بەکارهێنانی هێزو چەکی ئاگرین بن، یاخود لە کاتێکدا کەوا پێویستە بزانن ئەو کارمەندانە لە ژێر فەرمانی ئەوانەدا کاردەکەن بۆ جێبەجێکردنی یاسا پەنایان بردوەتە بەر بەکارهێنانی هێز و توندوتیژی بە شێوەیەکی نایاسایی، بێئەوەی ئەو هەنگاوانە پەیرەو بکەن کە پێویستە لەسەریان پەیرەوی بکەن بۆ رێگەگرتن، لە بەکارهێنانی هێز، یان راگرتن، یان ئاگادارکردنەوەی سەرووی خۆیان لەو بارەیەوە.

ب- نابێـت حكومەتـەكان و دامودەزگاكـانی جێبـەجێكردنی یاسا هیچ سزایەكی جینائی یان تەمبێكاری (تأدیب) بەسـەر ئـەو كارمەندانەی پۆلیسدا بسەپێنن كە دژی بەكارهێنانی هێزو چەك رادەوەستن، ئەمەش وەك پابەنـدبوونێك بـە بنـەماكانی شـێوازی رەفتـاركردنی پـۆلیس و سـەرجەم كارمەنـدانی راسـپێردراو بـە جێبەجێكردنی یاسا، یاخود ئەوانەی پابەندن بەم بنـەما و یاسـا سەرەكییانە.

ت- گوێڕایەڵی بۆ فەرمانەكانی سەرۆك و بەرپرسەكان نابێـت رەتبكرێتەوە و ئەگەر كارمەندانی پـۆلیس بـزانن كـە فـەرمان بـە بەكارهێنانی هێزو چەكی ئـاگرین دەبێتـە هـۆی مردنـی كەسـێك، یـاخود برینـداركردنی بـە شـێوەیەكی سـەخت، فـەرمانێكی نایاساییە. هەروەها ئەگەرهات و كارمەندانی پۆلیس دەرفەتێكی گونجاویان لەبەردەستدا بێت بۆ جێبەجێنـەكردنی فەرمانەكـە. مـاددەی(٢٦) لـەم بنەمایـەدا دەڵێـت "بەرپرسـارێتی دەكەوێتـە ئەسـتۆی فەرمانبـەرانی پلەبـەرزی پـۆلیس، واتـە ئەوانـەی كـە فـــەرمانی نایاســـایی دەردەكـــەن بـــۆ جێبـــەجێكردنی دژی مرۆڤەكان".

## تەوەری چوارەم

# بنەماكانی ڕێگەگرتن لە لەسێدارەدان لە دەرەوەی یاسا و لەسێدارەدانی بێ دادگایی

بەگشتی لە چواچێوەی بنەماكانی ڕێگەگرتن لە جێبەجێكردنی لەسێدارەدان لە دەرەوەی یاسا و لەسێدارەدانی دڕندانە و بێ دادگایی كردن، دوو بنەمای بنەڕەتی لەخۆدەگرێت، هەریەكەیان ئەو حوكمانە دیاریدەكات كە ئاماژە دەكەن بۆ لێپرسراوێتی تاكەكەسی پۆلیس لەكاتی جێبەجێكردنی یاساكاندا بەمشێوەیە :

١- پێویستە لەسەر حكومەتەكان ڕێگە لە ئەفسەر و فەرمانبەرانی پلەبەرز و دەسەڵاتە گشتییەكان بگرن لە دەركردنی ئەو فەرمانانەی كە ڕێگەدەدەن بە كەسانی تر هەر جۆرێك لە جۆرەكانی لە سێدارەدان ئەنجامبدەن لە دەرەوەی و یاسا و بەبێ دادگایی، یاخود ئەنجامدانی لەسێدارەدان بە شێوەیەكی دڕندانە، یان هاندان بۆ ئەنجامدانی ئەو كارە. هەر كەسێكیش لەوان مافی هەیە و پێویستە بە ئەركی مرۆڤانەی

خۆی بزانێت کە گوێڕایەڵی ئەو فەرمانانە نەبێت، چونکە نایاسایی و نامرۆڤانەن.

٢- هاوکات لەگەڵ پێشێلکردنی بنەمای(١) لە سەرەوە، نابێت هیچ فەرمانێك کە لە سەرۆکێك یان لە دەسەڵاتێکی گشتییەوە دەردەچێت، بکرێتە بیانوو بۆ ئەنجامدانی سزای لەسێدارەدان لە دەرەوەی یاسا و بە جۆرێکی دڕندانە و بێ دادگایی کردن. دەکرێت گەورە بەرپرسان و فەرمانبەران و خەڵکانی تریش لە فەرمانبەرانی گشتی دەوڵەت بەرپرسیار بکرێن لە بەرامبەر ئەو کارانەی کە ئەو کەسانە ئەنجامیان دەدەن کاتێك لە ژێر فەرمانی ئەواندا کاردەکەن، بەڵام ئەگەر بێت و دەرفەتێکی گونجاویان بۆ هەڵبکەوێت تا رێگە لە ئەنجامدانی ئەو جۆرە کار و رفتارانە بگرن، پێویستە دوودڵ نەبن.

## ئەرکی پۆلیس لە ئاگادارکردنەوەی پێشێلکارییەکان

هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد کە ماددەی(٨) لە یاساکانی رەفتارکردنی کارمەندانی راسپێردراو بۆ جێبەجێکردنی یاسا، باسی ئەرکی کارمەندانی پۆلیس دەکات لە ئاگادارکردنەوەی

سەرووی خۆیان لە هەر پێشێلکارییەك کە روویدات. بۆیە دەقی ئەم ماددەیە بە فیعلی بەسەر ئەو کارمەندانەدا دەسەپێنێت کە هەست بە رووداني یان نزیکبوون لە رووداني هەر پێلشێکردنێکی مافەکانی مرۆڤ هەبێت، بۆیە دەبێت یەکسەر لایەنە پەیوەندیدارەکانی لێ ئاگادار بکەنەوە، بە تایبەتیش ئەو دەسەلات و دەزگا تایبەتمەندانەی کە دەسەلاتیان هەیە لە لێپێچینەوە یان رێگەگرتن و نەهێشتنی ستەمکاریدا. بەپێی ئەم ماددەیە، پێویستە لەسەر کارمەندانی راسپێردراو بۆ جێبەجیکردنی یاسا ئەو ئاگادارکردنەوانە لە دەرەوەی زنجیرەی هەرەمی پلە و پایەکاندا ئەنجام نەدەن، تەنها لەو حاڵەتانەدا نەبێت کە رێگەی خێراتر و کاریگەرتر دەگیرێتەبەر بۆ ئەنجامدانی کارەکە بە سەرکەوتوویی.

هەروەها برگەی(٢) لە ماددەی(٧) دەڵێت"ئەو کارمەندانەی پۆلیس کە گومانیان هەیە یاخود پێیانوایە پێشێلکردنی ئەم کۆمەڵە بنەما یاساییە لە لایەنێکی دیاریکراوەوە دەکرێت، لەسەریانە لەکاتی پێویستدا یەکسەر مەسەلەکە بگەیەننە دەسەلاتەکانی سەرووی خۆیان، یا هیچ نەبێت لەسەریانە دەسەلات و دامودەزگا تایبەتمەندەکانیان لێ ئاگاداربکەنەوە،

واتـا ئەوانـەی کـە دەسـەڵاتی لێپێـچینەوەی یاسـایی و لابـردن و نەهێشتنی ستەمکاریان هەیە.

بەگـشتی سـەرجەمی ئـەو یاسـا و بنـەما نێودەوڵەتیانـەی دارێـژراون بـۆ بەڕێوەچـوونی کـاری دەزگاکـانی پـۆلیس بـە شێوەیەکی دادوەرانە، زۆر گرنگە وەکو خۆیـان جێبـەجێبکرێن. دەبینـین کاتێـك بـارودۆخێکی نائاسـایی روودەدات یـا لـە کـاتی باری فریاکەوتنی گشتیدا هێزەکـانی پـۆلیس دەکەونـە ژێربـاری گوشارێکی گەورە بۆ ئەوەی ئەدای کارەکانیـان کاریگـەر بێـت و ئـەنجام بەدەسـتبهێنێت، ئـەم گوشـارانەش بەگـشتی لـە سەرچاوەیەکی سیاسیەوە یان لە رێگەی رای گشیەوە یـا لـەناو خـودی دەزگاکـانی راسـپێردراو بـە جێبـەجیکردنی یاسـاکانەوە سـەرهەڵدەدەن. بۆیـە لـەم بوارانـەدا چـەندین کێـشە و گرفتـی یاسایی و ئەخلاقی دێنە بەردەم تاکەکانی هێزی پۆلیس لە کاتی جێبەجێکردنی پێوەرە مرۆییە نێودەوڵەتیەکاندا، چونکە هەرگیز جێبەجێکردنیان کارێکی هەروا ئاسـان نییـە، بـەڵام هەمیـشە بـە سەرچـاوەیەکی بەسـوود دەدرێنـە قەڵـەم بـۆ سـەرکەوتنی هەریەکێك لـە کارمەنـدانی دەزگاکـانی جێبـەجێکردنی یاسـا لـەو ئەرکانـەی خراوەتـە سـەر ئەسـتۆیان. واتـا رەفتـاری پـۆلیس و

ئـەخلاقی و یاسـایی ئـەو دەزگایانـە وادەخوازێـت کـە پێویـستە لەسـەر فەرمانبـەران و دامودەزگاکـانی پـۆلیس هەوڵبـدەن بـۆ هێنانەدی دادپەروەری و کاریگەری پیشەیی لەگەڵ رەچاوکردنی رێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ و بـەهای مرۆڤایـەتی لـە یـەك کاتـدا، چـونکە دەسـتەبەرکردنی کاریگـەری کـاری پـۆلیس سـەلیقە و توانایـەکی پیـشەیی و تـەکنیکی زۆری پێویـستە، بـەڵام ئاسـتی تواناکان هەرچەندێك بێـت کاریگـەری رەهـای کارەکـانی پـۆلیس بەبێ پشتیوانی و هاوکاری جەماوەر بەدینایەت. لەوەش گـرنگتر بەدەسـتهێنانی پـشتیوانی و هاوکـاری جـەماوەر لـە کاتێکـدا دەستەبەردەکرێت کە رەفتاری پۆلیس بە شێوەیەکی یاسـاییانە و مرۆڤدۆسـتانە بێـت، چـونکە هەمیـشە رەفتـاری توندوتیـژ و داپڵۆسـێنەرانەی پـۆلیس هەسـتکردن بـە تـرس و رقلێبوونـەوە دروستدەکات، بۆیە لە ئەنجامدا ئەمجۆرە دامودەزگـا پۆلیـسیانە شایانی ئەوە نین لەلایـەن خەڵکـەوە پـشتیوانیان لێبکرێـت و بـە هەند وەربگیرێن.

بـۆ جێبـەجێکردنی ئـەو پێـوەرە یاسـاییە ئـەخلاقی و نێودەوڵەتیانـە بـە شـێوەیەکی پراکتیکیانـە و بـە ئامـانجی

سەرخستنیان، پێویستە کارمەندانی پۆلیس پەیڕەوی ئەم هەنگاوانە بکەن:-

١- بەشداریکردن لە پرۆگرامەکانی مەشق و راهێنان لە کاتی خزمەتکردندا بۆ ئەوەی تێگەیشتنێکی باشیان هەبێت لەبارەی دەسەڵاتە یاساییەکانیان و ئەو کۆت و بەندانەی دێتە ڕێگەیان .

٢- نابێت هیچ کارمەندێکی پۆلیس گوێڕایەڵی بۆ فەرمانێکی سەرووی خۆی بکاتە پاساو بۆ ئەنجامدانی پێشێلکاریی مافەکانی مرۆڤ بە جۆرێکی ناڕەوا، بۆ نموونە وەك کوشتن و ئەشکەنجەدانی نامرۆڤانە بە شێوەیەکی نایاسایی و دوور لە پێوەرە مرۆڤایەتییەکان.

٣- کۆکردنەوەی زانیاری ورد دەربارەی ڕێوشوێنەکانی بەدواداچوونی سکاڵا و ئاگادارکردنەوە لە پێشێکارییەکانی مافی مرۆڤدا.

٤- لەبەرچاوگرتنی پاراستن و داکۆکیکردن لە مافەکانی مرۆڤ لە هەموو سیاسەت و ستراتیژە پەیڕەوکراوەکانی پۆلیس و هەموو ئەو فەرمانانەی لەلایەن سەرۆکەکانەوە دەردەچن و بەسەریاندا دەدرێت.

٥- لێکۆڵینەوەی تەواوو تەندروست لە هەموو راپورتەکان و سکالاکانی تایبەت بە پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ.

٦- دانانی کلێشەیەکی تایبەت بە رەفتارو جموجووڵەکانی دامودەزگاکانی پۆلیس بە مەرجێك ئەو کلێشەیە هەموو پێوەرە نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بە ئەرکی کارمەندانی راسپێردراو بە جێبەجێکردنی یاساکانی تیادا بنووسرێتەوە.

## تەوەری یەکەم

# لایەنە گشتییەکانی پێوەری جیاوازی نەکردن

چەند بنەمایەکی سەرەکی:

- هەموو مرۆڤەکان بە ئازادی لە دایك دەبن و یەکسانن لە ئەرك و مافەکاندا و ڕێزگرتنی کەرامەتی مرۆڤایەتی بۆ ژیانی کۆمەڵگاکان کارێکی پێویستە.

- دەبێت هەموو ئەوانەی یاسا جێبەجێدەکەن لە خزمەتی کۆمەڵگادا بن و هەموو تاکەکان بپارێزن لە ڕووبەڕووبوونەوەی کاری نابەجێ و نامرۆڤانە.

- هەموو مرۆڤەکان لەبەردەم یاسادا یەکسانن و بەبێ جیاوازی مافی ئەوەیان هەیە یاسا پارێزگارییان لێبکات و لەگەڵ ئەوانی دیکەدا جیایان نەکاتەوە.

- پێویستە پۆلیس پەیڕەوی جیاکاری نەکات لە نێوان مرۆڤەکاندا لەسەر بناغەی( ڕەگەز، ئیتنیك، ئاین، زمان، ڕەنگ، بیروڕای سیاسی، ڕەسەنایەتی نەتەوەیی، موڵکدارییەتی، شوێنی لەدلیکبوون یان هەر هۆکارێکی تر).

- سیاسەتەکانی دامەزراندن و کارپێدان و راسپاردن و بەرزکردنەوەی پلە و پایە لەناو دامودەزگاکانی پۆلیسدا دوور بێت لە هەر جۆرێك لە جۆرەکانی جیاوازیکردنی نامەشروع و نابەجێ.

## یەکەم: پێوەرە نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بە جیاوازینەکردن

میساقی نەتەوە یەکگرتووەکان دووپاتی دەکاتەوە کە دەبێت دەوڵەتانی ئەندام باوەڕییان هەبێت بەهەموو ئەو مافە سەرەکیانەی کە داڕێژراون بۆ رێزگرتن لە کایە و بەهاکانی مرۆڤ، هەروەك دەشبێت بە یەکسانی مافەکان بە هەموان بدەن. لەلایەکی تریشەوە پێویستە لەسەر دەوڵەتان بەڵێن نوێبکەنەوە بە بڵاوکردنەوەی هۆشیارییەکانی رێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکانی خەڵك بە گشتی، هەروەها هاندانی سەرجەم پێکهاتەکانی بۆ پەیڕەوکردنی ئەو کارە بەبێ جیاوازیکردن بەهۆی رەگەز یان زمان یان ئایین..هتد.

أ- هەموو پەیماننامە جۆراوجۆرەکانی تایبەت بە مافەکانی مرۆڤ، دەوڵەتان پابەند دەکەن بە ڕێزگرتن لەو مافانەی کە لەو پەیماننامانەدا بە وردی باسکراون بۆ لەبەرچاوگرتنی مافی هەمووان بەبێ جیاوازی. بۆ نموونە بڕگەی(١) لە ماددەی(٢)ی ڕێکەتننامەی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسیەکان پێداگری تەواو لەسەر ئەم مەسەلەیە دەکات.

ب- لەکاتێکدا ئەگەر دەوڵەتانی ئەندام پابەندییە یاساییە نێودەوڵەتییەکانی سەر ئەستۆیان جێبەجێبکەن یان جێبەجێیان نەکەن، لە ڕێگەی مامەڵەو ڕەفتاری ئەو کارمەندانەی کە لە جیاتی دەوڵەت پەیڕەوی دەسەڵاتەکان دەکەن. بۆیە زۆر گرنگە کارمەندانی دەزگاکانی پۆلیس لە بنەمای سەرەکی جیاوازینەکردن تێبگەن و ڕێزی لێبگرن. سەرباری ئەوەش زۆر گرنگە کارمەندانی پۆلیس تێگەیشتنیان بۆ سەرجەم ماددەو دەقەکانی مافەکانی مرۆڤ و یاسا و ڕێسا ناوخۆییەکان هەبێت، چونکە هەموو ئەو دەقە یاساییانە لەکاردان بۆ جێبەجێکردنی ئەو بنەما سەرەکییە.

ت- بنەمای جیاوازینەکردن خۆی لە خۆیدا بناغەیەکی سەرەکی و جەوهەرییە بۆ پاراستن و پتەوکردنی مافەکانی مرۆڤ

و ئازادییەکان، بۆیە سەرجەمی تاکەکانی ناو خێزانی مرۆڤایەتی مافی یەکسانیان بۆ دەستەبەرکراوە، ئەو مافانەش هەرگیز بوار بۆ دەستکاریکردنیان نییە، چونکە ئەو مافانە لە بەهای رەسەنی مرۆڤایەتی و شایستەیی کایەی هەموو تاکەکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی وەرگیراون، بەگشتیش هەموویان مافی جیهانین.

پ- ئەو بنەما سەرەکیانەی پێوەری جیاوازینەکردن لە مافەکاندا دەیانگرێتەوە ئەمانەن:

- یەکسانی لە مافەکاندا.
- دەستکارینەکردنی مافەکان بە هیچ شێوەیەك.
- بە جیهانیکردنی مافەکان.

ج- مافی تاك لە دانپێدانان بە کەسێتی یاساییدا کە لە ماددەی(٦) جارنامەی گەردوونی مافەکانی مرۆڤدا هاتووە "هەموو مرۆڤێك لە هەر جێگەیەك بێت مافی هەیە دان بە کەسێتی یاساییدا بنرێت". هەمان ئەم مافە لە دووتوێی ماددەی (١٦)ی رێکەتننامەی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسیەکاندا باسکراوە.

ح- دانپێدانان بە کەسێتی یاسایی مرۆڤ مافێکی سەرەکییە لە سیستەمێکدا کە مافەکانی مرۆڤ بە پێی یاسا تیایدا پارێزراو بێت. دەکرێت بێبەریکردنی مرۆڤ لەم مافە ببێتە هۆی بێبەریکردنی لە چەندین مافی تریش، چونکە ئەوە مافێکە سەرجەم هاوڵاتیانی دەوڵەت بەبێ جیاوازی هەیانە لە چوارچێوەی بوونی یەکسانی و مافی یاسایی بەرکەمال و فەراهەمکراودا.

دووەم: مافی یەکسانی لەبەردەم یاسادا

مافی یەکسانی لەبەردەم یاسادا بەپێی ماددەی (٧) لە جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤ چەسپێنراوە کە دەڵێت"هەموو مرۆڤەکان لەبەردەم یاسادا یەکسانن و پێویستە بەبێ جیاوازی لەلایەن یاساوە پارێزگارییان لێبکرێت و مافەکانیان پێشێل نەکرێت لە ئەنجامی هاندانی جیاوازیکردنەوە".

ڕێکەتننامەی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسیەکانیش چەند بنەمایەکی هاوشێوەی جاڕنامەی جیهانی گرتووەتەخۆ، بەوەی کە پێویستە یاسا هەموو جۆرەکانی

جیاوازیکردن قەدەغە بکات لەبەر هەر هۆیەك بێت وەك( رەگەز، ئێتنیك، رەنگ، زمان، ئایین، بیروڕای سیاسی). ماددەی (٣)ی میساقی ئەفەریقی بۆ مافەکانی مرۆڤ و گەلانیش ئەوە دووپاتدەکاتەوە کە" هەموومرۆڤەکان لەبەردەم یاسا یەکسانن و هەموو تاکێك مافی هەیە پارێزگاری یاسایی لێبکرێت بە یەکسانی لەگەڵ مرۆڤەکانی تر". هەروەها رێکەوتننامەی ئەمریکی بۆ مافەکانی مرۆڤ هەمان بنەمای تێدایە، ئەوەتا ماددەی(٢٤) لەو رێکەوتننامەیە دەڵێت"پێویستە مافی یەکسانی لەبەردەم یاسادا بەبێ جیاوازی بۆ هەموو مرۆڤەکان دەستەبەر بکرێت". بە راستی کارکردن بەم بنەما و پێوەرانە لەناو دامودەزگاکانی پۆلیسدا گرنگە، چونکە مانای ئەوە دەگەیەنن کە پێویستە لەسەر پۆلیس بە یەکسانی پارێزگاری بۆ هەموان دابین بکەن لە کاتی جێبەجێکردنی یاساکاندا. هەروەك نابێت پەنا ببرێتەبەر هەرجۆرە جیاکارییەکی زیانبەخش لە کاتی جێبەجێکردنی یاسادا.

## سێیەم: مافی مرۆڤ لە دادگاییکردنی دادپەروەرانە

مافی دادگاییکرنی دادپەروەرانە بەپێی ماددەی (١٠) ی جاڕنامەی گەردوونی مافەکانی مرۆڤ چەسپێنراوە کە دەڵێت"هەموو مرۆڤێك بە یەکسانی لەگەڵ ئەوانی تردا، مافی هەیە دادگایەکی سەربەخۆ و بێلایەن سەیری کێشەکەی بکات بە شێوەیەکی دادوەرانە و ئاشکرا، بە مەبەستی تێهەڵچوونەوە لە مافەکانی و پابەندییەکانی لە هەر تۆمەتێکی سزاییدا کە ئاراستەی بکرێت".

ماف لە دادگاییکرنی دادپەروەرانەدا بەپێی ماددەی (١٤) لە ڕێکەوتننامەی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکان چەسپێنراوە بۆ هەموو مرۆڤەکان بەبێ جیاوازی کە دەڵێت"مافی دادگاییکردنی دادپەروەرانە بۆ هەموو کەس یان تاك و مرۆڤێکە". لەو کاتەدا کە ئەم بنەمایانە چەند پابەندییەك بەسەر دادگاکان و سیستمە یاساییەکاندا دەسەپێنێت بە شێوەیەکی گشتی، بەڵام گرنگە لەیادمان نەچێت کە رەفتاری نائەخلاقی و نایاسایی و حەزکردن بە پەیڕەوکردنی جیاکاری کە لە لایەن پۆلیسەوە بگیرێتەبەر لە پرۆسەی جێبەجێکردنی یاساکاندا، دەکرێت ببێتە کۆسپ

لەبەردەم دەستەبەرکردنی ماف لە دادگاییکردنێکی دادپەروەرانەدا، بەڵام بۆ ئەوەی دادگاییکردنەکان بە شێوەیەکی دادوەرانە بەڕێوەبچێت، پێویستە دادگاکان دەسەڵاتی چاوخشاندنەوەیان بە هەموو بەڵگە راستێنراوەکاندا هەبێت، واتا ئەو بەڵگانەی کە لە رێگەیەکی یاسایی و راست و دروستەوە چنگ دەکەون، ئەوەش یەکێکە لە مەرجە پێویستەکان لە پێناو دەستەبەرکردنی مافی هەمووان لە دادگاییکردنێکی دادوەرانەدا.

### چوارەم: هاندان بۆ جیاوازیکردن

برگەی (٢) لە ماددەی (٢٠) ی رێکەوتننامەی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکان دەڵێت"یاسا هەموو جۆرە بانگێشتکردنێکی بۆ نەتەوەپەرستی و رەگەزپەرستی و جیاوازی ئاینی قەدەغە کردووە، چونکە هەموو ئەو شێوازانە بە جیاوازیکردن و دوژمنکاری و هاندان بۆ توندوتیژی دەدرێنە قەڵەم". بۆیە داوا لە هەموو دەوڵەتانی ئەندام لە رێکەوتننامەی نێودەوڵەتیدا کراوە هەڵبستن بە دارشتن و جێبەجێکردنی ئەو یاسانەی کە رێگە دەگرن لە هەموو جۆرەکانی هاندان بۆ جیاکاری و جیاوازیکردن لە نێوان مرۆڤەکاندا.

## تەوەری دووەم

# ئەرکەکانی پۆلیس لە سیستمی دیموکراتیدا

پرەنسیپە بنەڕەتییەکان:

– هیچ کەسێك ناچارناکرێت بە لە دەستدانی ماف و ئازادییەکانی، تەنها لەو سنورەدا نەبێت کە یاسا ئاماژەی پێداوە.

– هیچ بەربەستێك دانانرێت لەبەردەم بەکارهێنانی ماف و ئازادییەکاندا، جگە لەوەش دان بنرێت بە ماف و ئازادییەکانی خەڵکانی تردا و ڕێزیان لێبگیرێت.

– هەموو کەسێك مافی بەشداریکردنی هەیە لە بەڕێوەبردنی کاروباری گشتی نیشتمانەکەی، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان لە ڕێگەی نوێنەرەکانیانەوە کە بەشێوەیەکی دیموکراسی هەڵبژێرراون.

– دەسەڵاتی هاوڵاتیان ئاشکرا دەبێت لە ڕێگەی هەڵبژاردنێکی روون و ئاشکرا بەپێی دەنگدانی گشتی و بەشێوەیەکی یەکسانی لەنێوان دەنگدەراندا.

- هەموو دەزگایەکی جێبەجێکردنی یاسا بە شێوەیەکی گشتی نوێنەرایەتی کومەڵگا دەکات و لە ئاست داواکارییەکاندا دەبێت و بەرپرسیاریش دەبێت لەبەردەمیدا.

- هەموو تاکێک مافی رادەربڕین و کۆبوونەوە و بەشداریکردنی هەیە.

- هەموو فەرمانبەرانی دامودەزگاکانی پۆلیس بەشێکن لە کۆمەڵگا و ئەرکی خزمەتکردن و پاراستنی کۆمەڵگایان لە ئەستۆدایە.

## پێوەرە نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بە کاری پۆلیس لەسیستمی دیموکراتیدا

١.دەشێت دیموکراسیی مانایەکی زۆر بگرێتەخۆی لەڕووی شێوازەکانی سیستمی فەرمانڕەوایی جۆرەکانی و میکانیزمی کارکردنی دامودەزگا دیموکراسییەکان.

ئەم رێبەرە تایبەتمەندە بە کاری دامودەزگاکانی پۆلیس کە لەسەر ئاستێکی جیهانی بەکاردەهێنرێت، چونکە پەیوەندی بە پاراستنی مافەکانی مرۆڤ و جێبەجێکردنی یاساوە هەیە، هەروەها لە لایەکی تریشەوە بە زاراوەکانی و لە دووتوێی

ناوەڕۆکەکەید بەو شێوەیەی کە برگە بە برگە پڕمانایی و گرنگی مافەکانی مرۆڤ بە شێوەیەکی گشتی دەرئەبڕێ.

٢. بۆنموونە زۆربەی پرەنسیپ و بنەما سەرەکییەکانی کە پێشتر روونمان کردنەوە لە جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤەوە هەڵێنجراوە، بە تایبەتی لە ماددەی(٢١) هاتووە:

– هەموو کەسێك مافی بەشداریکردنی هەیە لە بەڕێوەبردنی کاروباری گشتی وڵاتەکەیداو راستەوخۆ یان بەهۆی نوێنەرانی گەلەوە کە ئازادانە هەڵدەبژێرێن.

– هەموو کەسێك وەکویەك مافی وەرگرتنی کارو فەرمانە گشتیەکانی لە وڵاتەکەیدا هەیە.

وەکو لە بەندی (٢١)دا هاتووە کە خواستی گەل سەرچاوەی دەسەڵاتی حکومەتە، ئەم خواستەش بەشێوەی هەڵبژاردنێکی دروست ودیاریکراوە.

– ئەم هەڵبژاردنە لەسەر بناغەی دەنگدانی نهێنی و یەکسانی هەمووان دەبێت، یان بە هەر چەشنێك دیاری بکرێت کە ئازادی دەنگدان بپارێزێت.

٣. پەیماننامەی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکان کە هەمان ئەو مافانە دەگرێتەخۆ وەکو لە بەندی (٢٥)دا هاتووە:

– بەشداریکردن لە بەڕێوەبردنی کاروباری گشتیدا بە شێوەیەکی راستەوخۆ یان بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دروستە.

– بەشداریکردن لە دەنگدان و هەڵبژاردنەکاندا بەشێوەیەکی دروست و دیاریکراو بە بەردەوامی.

٤. دیموکراسیی پەیوەندی بە دوو بنەمای سەرەکی گرنگەوە هەیە بۆ بەجێگەیاندنی یاسا کە بریتین لە:–

* بڕیارە یاساییەکان.

* پتەوکردن وپاراستنی مافەکانی مرۆڤ.

لە راستیدا ئەم بنەمایانە پێکەوە گرێدراون لەبەرئەوەی لە سیستمە دیموکراسییەکاندا چاکترین هەنگاوی بەسوودن بۆ پاراستنی مافەکانی مرۆڤ لە رێگەی پرۆسە دیموکراتیەکانەوە، هەروەها کاریگەری زۆریشی هەیە لەسەر ناوەڕۆکی بڕیارە یاساییەکان. دەقی بەندەکانی جاڕنامە و رێککەوتننامەکانی مافی مرۆڤ هەموویان بنەمای جەوهەرین بۆ بەڕێوەبردنی پرۆسە دیموکراتییەکان و سیستمی یاسایی دروست دەگرنەخۆ و لە

بـــواری جێبەجێکردنیانـــدا خزمـــەتێکی گـــەورە بـــە کۆمەڵگـــە دیموکراسییەکان دەکەن.

٥. چەند لایەنێکی گرنگ هەیە دەربارەی کاری پـۆلیس لـەناو سیستمە دیموکراسییەکاندا، بۆیە پێویستە بە فراوانـی ئامـاژەی پێبـــدرێت لـــە پێنـــاو دەوڵەمەنـــدکردنی ســـەرنج و تێبینیـــە سەرەتاییەکانی دەزگاکانی پۆلیس تاوەکو تاکەکانی پـۆلیس بـە پۆلیـسی دەوڵـەتی دیمـوکراتی نـاوزەد بکـرێن، چـونکە کـار بـۆ جێبەجێکردنی پـەیامێکی مرۆڤایـەتی پـیرۆز دەکـەن لـە سـایەی سیستمێکی دیموکراتیدا.

ئەمجۆرە ناوبانگ و ئاستانە بە هـەنگاوێکی گـرنگ دادەنرێـت بۆ هەر دەوڵـەتێکی موئەسەسـاتی (دیمـوکراتی)، چـونکە بـاش بەڕێوەچوونی کاری دامودەزگاکانی پۆلیس، یەکێکە لـە ئـامرازە گرنگـەکانی سیـستمی دیموکراسـی بـۆ بـەڕێوەبردنی کاروبـاری دەسەڵاتی جێبەجێکردن لەناو کایەی دەوڵەتدا، لە کاتێکدا ئەوە یەکێکە لە سیما جوانەکانی پرۆسەکانی پەیڕەوی دیموکراسیی و چـۆنێتی بـــەڕێوەبردنی دەســـەڵات و دەســـتەبەرکردنی مافـــە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ.

لە دەوڵەتی دیموکراتیدا کاری تاکەکان و دامودەزگاکانی پۆلیس لەسەر بنەمای ئەو مافانە جێگیردەبێت. یەکێکیش لە پێویستییەکانی کاری دیموکراسیانەی پۆلیس بریتیە لە بەرپرسیارێتی پۆلیس بەرامبەر بە هاوڵاتیان، چونکە پارێزگاریکردنی هاوڵاتیان و دوورخستنەوەیان لە تاوان و کاری نادروست و نامرۆڤانە و ئاراستەکردنی بەرەو ئارامی و خۆشگوزەرانی، بەشی هەرەزۆری لە ئەستۆی پۆلیس و دامودەزگا ئاسایش پارێزەکانی تردایە.

## تەوەری سێیەم

# لایەنەگشتییەکانی کارکردنی پۆلیس لە سیستمە دیموکراسییەکاندا

**بنەما سەرەکییەکان:**

ئەو بنەما دیموکراسیە سەرەکییانەی کە دیاریکراون و تەواو پەیوەندیدارن بە مافەکانی مرۆڤ، رێچکەی راستەقینەی کاری مرۆیی و یاسایی دەوڵەت دەستنیشان دەکەن، ئەو بەندانەش بە گشتی ئەمانەن:

* ئەو دەسەڵاتەی لەسەر بناغەی بەشداریکردن و نوێنەرایەتیکردن پێکهێنراوە (بەبێ ئەوەی نکۆڵی لەوە بکات کە تاکەکان مافی بەشداریکردنیان هەیە لە بەڕێوەبردنی وڵاتەکەیاندا بە شێوەیەکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ).

* هەموو کەسێك مافی وەرگرتنی ئەرك وکارو فەرمانە گشتییەکانی لە وڵاتەکەیدا هەیە بە یەکسانی لەگەڵ کەسانی تردا.

* دەنگدانی گشتی بە یەکسانی لە نێوان دەنگدەراندا لە هەڵبژاردنێکی دروست و دیاریکراو دەبێت.

**ڕێزگرتن لە ئازادیە بنەڕەتییەکان:**

مەبەست ئەم ئازادیە دیاریکراوانەیە کە لە دەقەکانی مافی مرۆڤ هاتوون بۆ بەجێگەیاندنی یاسا و ڕێساکانە و ئەو پەیماننامانەی کە لە دواییدا باسیان لێوە دەکەین سەرجەمیان پێداگری لەسەر ئەو مافانە دەکەنەوە و بەرز دەیان نرخێنن.

ئەو پەیماننامە دیاریکراوانەی کە پەیوەندیان بە کاری پۆلیسەوە هەیە لەناو سیستمە دیموکراسییەکاندا وەك خۆی هەمان ئەو بنەمایانە لە پەیماننامەی تایبەت بە مافەکانی مرۆڤدا هاتووە.

**مافی ئازادی بیروڕاو وابەستەیی ئاینی**

أ- ئەم مافانە بەپێی جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ لە بەندی (١٨) و پەیماننامەی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکان و بەندی (١٨) لە بەڵێننامەی ئەفریقی بۆ مافەکانی مرۆڤ وگەلان و بەندی (٨) لە ڕێکەوتننامەی ئەمریکی بۆ

مافـــەکانی مـــرۆڤ و  بەنـــدی(١٢)ی ڕێکەوتننامـــەی ئـــەوروپی بـــۆ مافەکانی مرۆڤ پارێزراون.

ب- ئەوەی ئاشکرایە کە ئـازادی بـیروڕای سیاسـی و ئـاینی گرنگـە بۆکەسـەکان، چ وەکـو تـاك یـان وەکـو کۆمـەڵ، تـاوەکو بتوانن بیربکەنەوە و بیروبۆچۆنەکانیان بخەنەڕوو، ئەمەش خـۆی بـــۆ خـــۆی ڕەگـــەزێکی ســـەرەکییە بـــۆ هـــەموو کاروبـــارە سەرەکییەکان و پرۆسە دیموکراسییەکان.

ماف لە نێوان ئازادی بیرورا دەربڕیندا

- ئـەم مافــە بــەپێی جاڕنامــەی جیهــانی مافــەکانی مــرۆڤ بەندی(١٩) و پەیمانی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە مەدەنییەکان و سیاسـییەکان و بەنـدی (١٩) لـە پەیماننامـەی ئەفـەریقی بـۆ مافــەکانی مــرۆڤ و گــەلان و بەنــدی(١٣)  لــە ڕێککەوتننامــەی ئەمریکی بـۆ مافـەکانی مـرۆڤ و بەنـدی (١٠) لـە ڕێککەوتننامـەی ئەوروپی بۆ مافەکانی مرۆڤ پارێزراوە.

- ئـازادی ڕادەربـڕین هـەروەك ئـازادی بیرکردنـەوە شـتێکی جەوهەریـــە لـــە پرۆســـە سیاســـیەکاندا و توانـــای گەیانـــدن پێکەوەلکانـدنی بیرکردنـەوە و بۆچـوونەکان لەگـەڵ بیروڕاکـانی

تـردا بەرجەسـتە دەكـات و هـەنگاوی پێویـستتر بـۆ پرۆسـەی پەیڕەوكردنی دیموكراسی دێنێتە كایەوە.

## مـافی ئـازادی بەشـداریكردن لـە كـۆڕ و كۆبوونـەوەكان و كۆمەڵەكاندا

ئـەم مافانـەش بـەپێی مـاددەی(٢٠)ی جاڕنامـەی جیهـانی مافەكانی مرۆڤ بەندەكانی(٢١،٢٢)ی پەیماننامـەی نێودەوڵـەتی تایبەت بە مافە مـەدەنی و سیاسـییەكان بەنـدەكانی(١٠،١١) لـە پەیماننامـــەی ئـــەفریقی بـــۆ مافـــەكانی مـــرۆڤ و گـــەلان و بەنـدەكانی(١٥–١٦) لـە ڕێكەوتننامـەی ئـەمریكی بـۆ مافـەكانی مرۆڤ بەندی(١١)ی ڕێكەوتننامەی ئەوروپی بۆ مافـەكانی مـرۆڤ پارێزراون.

كاروبـــارە ســـەرەكییەكان بـــەڕێوە نابرێـــت تـــەنها بـــە بەشداریكردنی كەسانی ترنەبێت لە هەر یەك لەو دامودەزگایانەدا كـە بازنـەی پەیوەنـدیان هەیـە بـۆ گەیانـدنی بـیرو بۆچـۆن و پێشنیارە سیاسیەكان.

## تەوەری چوارەم

# مافە سیاسییەکان و رۆڵی پۆلیس

١- هەموو ئەو مافە سیاسیانە دەگەرێتەخۆ کە پێشتریش باسیان لێوەکراوە و بەپێی پێوەرە نێودەوڵەتیەکان پەسند کراون و بوونەتە یاسایەك بۆ دەوڵەت، چونکە دەوڵەت لایەنێکی هەمیشەیی پێکدەهێنێت لە پەیماننامە و رێکەوتننامە جۆراوجۆرەکاندا. لە ئەنجامەکانی کارو رەفتاری دامودەزگاکانی پۆلیسدا ئەم مافانە پێویستیان بە چاودێریکردن و پارێزگاری لێکردن هەیە.

٢- بەهۆی چەند رێگایەکەوە دەتوانرێت سەیری کاری پۆلیس بکرێت بەوەی کە ئامێرێکە یاخود دەزگایەکە بۆ رێکخستنی مافە سیاسییەکان بەو شێوەیەی کە خەڵکی بتوانێت چێژ لە مافەکانیان وەربگرن، وەك هەنگاوێك بۆ دەستەبەرکردنی هاوسەنگی راست و دروست و رەوا لە نێوان سیستمی گشتی و سوودوەرگرتن لە مافەکانیان بە یەکسانی لەگەڵ ئەوانی تردا.

٣- بە شێوەیەکی گشتی دەبێت پۆلیس پارێزگاری لە سیستمی کۆمەڵایەتی بکات کە( ئاشتی و ئارامی و یەکسانی کۆمەڵایەتی) دەگرێتەوە، تاکو بتوانێت پرۆسەکانی مافپارێزی و یاساپارێزی بە شێوەیەکی دەستوری و دادپەروەری جێبەجێ بکات تاوەکو مرۆڤ بتوانێت سوودمەندبێت لە مافە مەدەنی و سیاسییەکان پێویستەکان هەروەك لە بەندی(٢٨)ی جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤدا ئاماژەیان پێکراوە.

٤- هەموو کەسێك شایستەی سوودوەرگرتنی لە سیستەمێکی کۆمەڵایەتی و نێونەتەوەیی دادوەرانەدا هەیە کە لە سایەیدا هەموو ماف و ئازادییەکانی کە لە جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤدا نووسراون دەستەبەر بکرێت و بەتەواوی پەیامی مرۆڤایەتی بەدی بێت.

سەرچاوە و سیستم و پێوەرەکانی مافی مرۆڤ لە بەجێگەیاندنی یاسادا:

## رێکەوتننامە و پێوەرە نێودەوڵەتییەکان

١- ژمارەیەك لە ئاژانسەکانی سەربە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان هەستان بەدانانی ئەو پێوەرە نێودەوڵەتیانەی

پەیوەندییان بە مافەکانی مرۆڤەوە هەیە لە کاتی بەجێگەیاندن و جێبەجێکردنی یاساکاندا و لە سەروی ئەم ئاژانسانەوە لیژنەی مافەکانی مررۆڤ و لیژنە فەرعیەکان (لقەکان) هەن، ئەوانەی کە پەیوەندیان هەیە بە بواری نەهێشتنی تاوان ومامەڵەکردنی مرۆییانە لەگەڵ تاوانباراندا.

ئەم پێوەرانە لەلایەن کۆمەڵەی گشتی و ئەنجوومەنی ئابوری و کۆمەلایەتیەوە لە کارپێکردن بەستکران. ئەم دوو ئاژانسە بە ئاژانسە سەرەکیەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان دادەنرێن، چونکە کارکردن و ئەرکەکانیان هەمیشە قالّبێکی جیهانی وەرگرتوە، بەو واتایەی کە کومەلگای نێودەولّەتی بە شێوەیەکی گشتی پەسندی کردوە، بەو پێیەی کە ئەوە نزمترین بناغەیە بۆ بەجێگەیاندن و جێبەجێکردنی یاسا و رێسا مرۆییەکان بە جۆرێکی دادپەروەرانە، بەبێ بایەخدان بە سیستمی یاسایی یاخود چوارچێوەی یاسایی خودی دەولّەتەکان و لەناو ولاتە ئەندامەکاندا پەیرەو دەکرێت.

٢- ناوەڕۆکی ئەو پێوەرانە و وردەکارییە مرۆییەکانیان کە پەیوەندییان هەیە بە جێبەجێکردنی یاساکان بە شێوەیەکی گونجاو لەسەر ئاستی نیشتمانی، لەناو یاسا گۆڕاوەکانی تایبەت

بە لیژنـەی مـافی مرۆڤـی نەتـەوە یـەکگرتووەکان، کـە ئەمـە دەسـتەیەکە بـۆ تێبینیکـردن و تێـڕوانین لـە پەیماننامـەکان پێکهێنراوە بە پێی پەیماننامـەی نێودەوڵـەتی تایبـەت بـە مافـە مەدەنی و سیاسییەکان.

٣- پێش ئەوەی باس لـەو سەرچاوە و سیستم و پێوەرانـە بکەین کە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی پەیڕەوکراون، دەبێت بـاس لە نرخ و بەها یاساییەکانی ئەو پێوەرانە بکەین.

خستنەڕووی ئەو کۆمەڵە پێوەرانە کە لە چوارچێوەی یاسـای نێودەوڵەتیـدا کاریـان پێـدەکرێت و ئەیانگرێتـەخۆ کـە لـەنێوان سەرجەم پەیماننامەکانی ناو هەردوو پەیماننامـەی نێودەوڵـەتی و پەیماننامـەکانی لەخۆیـدا کۆیدەکاتـەوە تادەگاتـە خواسـتی ئاراسـتەکراوی جیهـانی بـە شـێوەیەکی ئـەخلاقی کـە لـە میـانی هـــەموو جاڕنامـــە و پەیماننامـــەکان و یاســـا و ڕێـــساکاندا خراونەتـــەڕوو بـــۆ پاراســـتنی مافـــەکانی مـــرۆڤ و نەهێـشتنی پێشێلکارییەکان.

٤- ئـــەم هـــەموو یاســـا و ڕێـــسا نێودەوڵەتیـــە پێکـــەوە چواچـێوەیەکی یاسـایی نێودەوڵـەتی گـشتگیر و تێروتەسـەل

دەخاتەڕوو لە پێناو ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ و ئازادی و کەرامەتی مرۆڤ لە بۆتەی دادپەروەری مرۆڤایەتیدا.

٥- لە ڕووی یاساییەوە دەتوانین بڵێین کە مۆرکێکی یاسایی پابەندکراو لەو پەیماننامە فەرمییانەی کە دەوڵەتان پەسندیان کردووە یاخود تیایدا بوونەتە ئەندام بەدی دەکرێت و پێوەیان پابەندن ئەم پەیماننامانەش بریتین لە:

- پەیماننامەی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکان.

- پەیماننامەی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە کۆمەڵایەتی و ئابووری وکلتورییەکان.

- ڕێکەوتننامەی مافەکانی منداڵ.

- ڕێکەوتننامەی ڕێگەگرتن لە ئەنجامدانی تاوانی جینۆساید و سزادانی ئەنجامدەرانی. هەروەها ژمارەیەك پەیماننامەی دیکەش هەن کە پێداگری لەسەر پارێزگاریکردن لە مافەکانی مرۆڤ دەکەنەوە.

پێویستە ئاماژەش بکەین بە میساقی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان کەخۆی لە خۆیدا لە ڕووی یاساییەوە ڕێکەوتننامەیەکی پابەندە (ملزم) بۆ هەموو دەوڵەتانی ئەندام

له ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا. بەڵام نابێت پەنابرێت بۆ هەندێك پاساوی یاسایی یان تیۆری لە پێناو پشتگوێ خستنی بەهای پراکتیکی هەموو ئەو جاڕنامە و پەیماننامەو ڕێسا ئاڕاستەکراوانە، شان بەشانی ڕێکەوتننامە نێودەوڵەتیە پەیوەندیدارەکان.

- پەیماننامەی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافەی مەدەنی و سیاسیەکان بەگشتی لەمانگی ئاداری (١٩٧٦)دا دەست بە جێبەجێکردنی کرا و چەند وردەکاریەکی دیکە بۆسەر ئەو مافانە زیادکران کە لە سەرەوە باسمان لێکردن.

هەریەك لە ماددەکانی (٦-٧-٩-١١-١٤-١٥) لەم پەیماننامەیە بە دوورودرێژی باسی مافی ئافرەتان و نەهێشتنی ئەشکەنجەدان و قەدەغەکردنی دەستگیرکردن و دەستبەسەرکردن بە شێوەیەکی دڕندانە دەکات، هەروەها باسی ڕێگاگرتن لە بەندکردن دەکات لەکاتی نەتوانین بە پابەندبوونی یاسایی بەشێوەیەکی پابەند (ملزم) ، هەروەها باسی مافی تاك لە دادگایکردنێکی عادیلانە و قەدەغەکردنی جێبەجێکردنی ڕێوشوێنە تاوانکارییەکان (الاجرائات الجنائیە) دەکات بە پێی دەرچوونی حوکمێکی پێشوو، ئەم پەیماننامە نێودەوڵەتیە کە

ژمارەی ئەندامەکانی لە(١٠٠) دەوڵەت زیاترە، بریتیە لە یاسایەکی پابەند (ملزم) لە چوارچێوەی یاسای نێودەوڵەتیدا، بۆیە پێویستە لەسەر هەموو حکومەتەکان و دامودەزگا پەیوەندیدارەکان کە رێزیان لێبگرن بە دەزگاکانی پۆلیسیشەوە، لەوەش گرنگتر لیژنەیەکی تایبەت بە مافەکانی مرۆڤ کە بەپێی حوکمەکانی ئەم پەیماننامەیە دانراوە داکۆکی تەواو لەو مافانە دەکات و هەڵدەستێت بە چاودێریکردن و جێبەجێکردنی ئەم یاسایانە لەسەر ئاستی جیهانی.

## تەوەری پێنجەم

# پەیماننامەی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە ئابوری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییەکان

لە کاتێکدا ئەم پەیماننامە نێودەوڵەتیە جەخت ئەکات بۆ بەجێگەیاندنی یاساکان و پێوەرە مرۆییە نێودەوڵەتییەکان، هەرچەندە ئەو یاسا و رێسایانە مۆرکێکی سیاسی یان مەدەنیانەیان هەیە، بەڵام دەستپێکردن بە هەرکارێکی جیاواز لە ناوەرۆکی ئەم پەیماننامەیە هەڵەیە، واتا بەبێ ئاماژە کردن بە پەیماننامەی تایبەت بە مافە ئابوری وکۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییەکان کە لە کانونی دووەمی ساڵی ١٩٧٦ جێبەجیکراوە و سێ خاڵی گرنگ هەیە بۆ نیشاندانی گرنگیی ئەم پەیماننامە نێودەوڵەتیە:

أ- یاسا لە بۆشاییدا جێبەجێ ناکرێت، بەڵکو پۆلیس دەبێت ئەرکە یاسایی و مرۆییەکانی خۆی جێبەجێ بکات، تەنانەت لە چوارچێوەی ئەو بارودۆخە ئابورییەشدا کە رووبەڕووی خەڵك دەبێتەوە. ئەوانەی کە پۆلیسن و

جێبەجێکاری یاساکانن سوێندی یاساییان خواردوە بۆ خزمەتکردنی خەڵك و پاراستنی مافەکانیان.

ب- شتێکی دروست نیە ئەگەر گریمانی ئەوە بکەین کە مافە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان، کۆمەڵێك کارن پەیوەندییان نییە بە کاری رۆژانەی پۆلیسەوە و نموونە ئاشکراکان بۆ مافە ئابورییەکان ئەوانەی کە پەیوەندییەکی راستەوخۆیان هەیە، وەك جیاوازی نەکردن و پاراستنی مرۆڤ لە دەرکردنی بەزۆر و رەخساندنی پێوەرە بنەڕەتییەکان بۆ کارکردن، ئەمانە هەرگیز بەدەر نین لە بۆتەی کاری دامودەزگاکانی پۆلیس.

ت- لەسەر ئاستی جیهانی دان بەوەدا نراوە کە ئەم جۆرە مافانە لەو پەیماننامەیەدا هەردوو پەیماننامە نێودەوڵەتیەکە دەپارێزن و بەرز رایاندەگرن، چونکە مافەکان یەکسان و پێکەوە پەیوەندیدارن.

١٠- سەرەڕای ئەوەی تێبینی ئەوە دەکەین کە پەیماننامەی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە ئابوری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییەکان بەشێکی زۆر لە مافەکان دەپارێزێت، لەوانەش وەك (مافی کارکردن). پێویستە مرۆڤ مافی ئەوەی هەبێت کە بەپێی مەرجی گونجاو مافی رێکخستنی سەندیکای کرێکاران و

بیمەی کۆمەڵایەتی و دڵنیایی و مافی پارێزگاریکردنی خێزان و منداڵی هەبێت، چونکە یاسا و رێسا نێودەوڵەتییەکان پارێزگارییان لێدەکات، هەروەها مافی بەدەستهێنانی بژێویەکی گونجاو و مافی تەندروستی و مافی بەشداریکردنی لە ژیانی کلتوریدا هەیە.

لیژنەی مافە ئابوری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییەکانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان، سەرپەرشتی و ئەرکی چاودێریکردنی ئەم یاسایە دەکات.

پرۆتوکۆلی ناپابەندی یەکەمی پەیماننامەی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکان

دەستپێکردن بەجێبەجێکردنی پرۆتوکۆڵی ناپابەندی یەکەمی پەیماننامەی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکان هاوکات بوو لەگەڵ هاتنەکایەی پەیماننامەکە. ئەم رێسایە رێگا بە لیژنەی تایبەت بەمافەکانی مرۆڤی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان دەدات بە وەرگرتن و لێکۆڵینەوە لەو سکاڵایانەی کە لەلایەن ئەو کەسانەوە بەرز کراونەتەوە کە خۆیان بە قوربانی دەستی پێشێلکارییەکان دەدەنە قەڵەم، ئەو مافانەش بەگشتی لە پەیماننامەکەدا بە روونی ئاماژەیان پێکراوە.

بۆ تێڕوانینی ئەم سکاڵایانەش، لیژنەکە هەڵسا بە دانانی کۆمەڵێکی زۆر لەو دەقە یاساییانەی کە ئاڕاستەکردنێکی بەسوود دەستەبەر دەکەن بۆ شیکردنەوەی ئەو کاریگەرییانەی کە پەیماننامەکە دەیانگرێتە خۆ و تایبەتن بەکاری دامودەزگاکانی پۆلیسەوە.

## پرۆتۆکولی ناپابەندی دووەمی ڕێکەتننامەی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکان

لە کاتێکدا کە ڕێکەتننامەی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکان سزای لەسێدارەدانی قەدەغە نەکردوە، بەڵام لە هەمانکاتدا چەند کۆت و بەندێکی توندی سەپاندووە لەسەر کارپێکردن بەم سزایە. بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو لایەنگرییە زۆرەی لە چواچێوەی زەمینەی ڕای گشتی نێودەوڵەتیدا هەیە بۆ لابردنی سزای لەسێدارەدان بەشێوەیەکی کۆتایی، کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی(١٩٨٩) پرۆتۆکۆڵی ناپابەندی دووەمی پەیماننامەی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکانی پەسندکرد بەمەبەستی لابردن و هەڵوەشاندنەوەی سزای لەسێدارەدان، ئەم

پرۆتۆکۆلەش رێگا لە دەوڵەتانی ئەندام دەگرێت کە پەناببەنەبەر بۆ کارپێکردنی سزای لەسێدارەدان بە هەر جۆرێك بێت.

بنەماکانی رەفتاری ئەو کارمەندانەی ئەرکی جێبەجێکردنی یاساکان دەگرنە ئەستۆ

کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە کانوونی دووەمی (١٩٧٩)دا بنەماکانی رەفتاری ئەو کارمەندانەی ئەرکی جێبەجێکردنی یاساکان دەگرنە ئەستۆ، پەسندکردووە.

ئەم تۆمارە پێکهاتووە لە (٨) ماددەی بنەڕەتی کە ئەرکە سەرەکییەکانی ئەو فەرمانبەرانە دیاریدەکات کە جێبەجێکردنی ئەم یاسایانەیان لە ئەستۆدایە لە بواری خزمەتکرنی کۆمەڵگا و پاراستنی مافەکانی مرۆڤ و مامەڵەکردن لەگەڵ زانیارییە نهێنییەکان و قەدەغەکردنی ئەشکەنجەدان و مامەڵەی نامرۆییانە و پارێزگاری کردن لە ژیان و تەندروستی دەستبەسەر وگیراوەکان و قەدەغەکردنی گەندەڵی و رێزگرتن لە یاساکان و دەقەکانی ناو ئەم بنەما یاساییانە.

دوابەدوای هەموو بەندێك روونکردنەوەیەکی ورد دەکرێت لەسەر پوختەی دەقی ماددەکان، ئەم تۆمارە لە ناوەڕۆکیدا

ڕەفتارەکانی کارمەندانی پۆلیس دیاریدەکات لەسەر ئاستی جیهانی.

بنەما سەرەکییەکانی بەکارهێنانی هێزو چەکی زیندوو

سەرجەم ئەو بنەما سەرەکییانەی پەیوەندیدارن بە بەکارهێنانی هێزو چەکی زیندوو لە لایەن ئەو کارمەندانەی ئەرکی جێبەجێکردنی یاسایان پێ سپێردراوە، لە کۆنگرەی هەشتەمی نەتەوە یەککگرتووەکاندا پەسندکران. بەمەبەستی ڕێگەگرتن لە ئەنجامدانی تاوان و خراپ مامەڵەکردن لەتەك تاوانبارانـدا، ئەم کونگرەیە لە ساڵی (١٩٩٠) بەستراو تێیدا ئاماژە بۆ تەواوی ئەو بنەما نێودەوڵەتیانە کراوە کە هەموو ئەو بارودۆخانەی لەبەرچاو گرتووە لە کاتی جێبەجێکردنی یاساکاندا، بەتایبەتی لە کاتێکدا کە مەترسی هەبێت بۆسەر مافەکانی مرۆڤ، هەروەها بنەماکان سەرنجی ئەوەشیانداوە کە هەڕەشەکردن لە ژیان و سەلامەتی فەرمانبەرانی راسپێردراو بەجێبەجێکردنی یاسا، لە هەمانکاتدا هەڕەشەیە بۆ سەر سەقامگیری کومەڵگا بە گشتی و بنەماو ڕێساکان، لە هەمانکاتدا کۆت و بەندی توند دەسەپێنن بەسەر دەسەڵاتەکانی پ[illegible]

بەکارهێنانی هێزو چەکی زیندوو، تەنانەت لەو کاتەشدا کە تێیدا ڕێگەی پێدراوە و شێواز وچۆنیەتی بەکارهێنانیدا چی پێویستە دوای بەکارهێنانی بکرێت، هەروەها لێپێچینەوەش بەرامبەر بە خراپ بەکارهێنانی دەکرێت، ئەم بنەمایانە جەخت لەسەر ئەوەش دەکەنەوە کە نابێت هێز بەکاربهێنرێت، تەنیا لە بارودۆخی زۆر پێویستدا نەبێت بە ئاستێکی وا کە بەڕێوەبردنی ئەرك و کارەکانی کارمەندانی جێبەجێکردنی یاساکان شێوەیەکی یاسایی و مەشروع دەخوازێت، دەکرێت بڵێین ئەم بنەمایانە ئەنجامی پارێزگاریکردنە لە هاوسەنگیەکی گەورە لە نێوان ئەرکی پۆلیس لە پاراستنی مافی هاوڵاتیان لە ژیاندا و ئازادی و ئارامی تاك.

## تەوەری یەکەم

# بنەما سەرەکییەکانی داد پەروەری
# تایبەت بە قوربانیانی تاوان

١- ئـەو سـێ رێـسایەی کـە پەیوەندیـدارن بـە چـۆنیەتی مامەڵـــەکردنی جێبـــەجێکارانی یاســـا لەگـــەڵ بەنـــدکراوو دەستبەسەرکراواندا سیستەمێکی تۆکمەو گشتگیر پێکدەهێنن بۆ پاراستنی مافی خەڵکانی بەندکراوو دەستبەسەرکراو.

کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لـە کـانوونی یەکـەمی سـاڵی ١٩٨٨دا کۆمـەڵێك بنـەمای لـەم بارەیـەوە پەسـند کـرد. کۆمەڵەکـە رایـسپاردووە بـە دارشـتنی سیـستەمی بنـەماکانی رفتـارکردن و لــە کـونگرەی یەکـەمی نەتـەوە یـەکگرتووەکان پەسندکراوە لە پێنـاو رێگـرتن لـە روودانـی تـاوان و رێکخـستنی شـێوازەکانی مامەڵەکردنی تاوانکـاران کـە لـە سـاڵی ١٩٥٥دا لـە جنێف بەستراوە، پاشـان لـە لایـەن ئەنجوومـەنی کۆمەڵایـەتی و ئابوورییـەوە پەسـندکرا، بـەڵام ئـەو بنـەما سـەرەکییانەی کـە کۆمەڵـــەی گـــشتی نەتـــەوە یـــەکگرتووەکان لـــە کـــانوونی

یەکەمی ١٩٩٠دا پەسندی کرد، بریتین لە بنـەما تەواوکارییـەکانی سیستەمەکە و بە کۆی(١١) پێوەری دیاریکراو دارێژراون.

٢- لە دەقـی ئـەو بنەمایانـەدا هـاتووە دەڵێـت کـە پێویستە سـەرجەم بەنـدکراو و دەستبەسـەرکراوان بـەڕێزەوە مامەڵـەیان لەگەڵـدا بکرێـت و کەرامـەتی مرۆڤایـەتیان لەکـەدار نـەکرێت، بەتایبەتیش لەبارەی بارودۆخی دەستبەسەرکردنیان و چۆنیەتی رەفتـارکردن لەگەڵیانـدا و پەیوەنـدییان بـە کەسـانی دەرەوەی بەندیخانـــەوە، هــــەروەها پــــۆلێنکردن و تۆمارکردنیـــان و پارێزگـاریکردن لـە تەندروسـتیان و وەرگرتنـی سـکاڵاو تۆمـاری کەســـییان و دابینکردنـــی دەرفـــەتی کـــارکردن و حـــەزو ئارەزووەکانیان و رێزگرتن لە ئایین و کلتوورییان.

١- نەتـــەوە یـــەکگرتووەکان دەســـەڵاتی یاســـادانانی خـــۆی خستوەتەگەڕ لە خزمەتی مەسەلەیەکی گرنگدا ئەویش پاراستنی مافی قوربانیانی دەستی تاوانە. لە پێنـاوی بەدەسـتهێنانی ئـەم ئامانجەدا کۆمەڵەی گـشتی نەتـەوە یـەکگرتووەکان لـە تـشرینی دووەمی ١٩٨٥دا جاڕنامەی بنـەما سـەرەکییەکانی دادپـەروەری ســـەبارەت بـــە مـــافی قوربانیـــانی دەســـتی تـــاوان و خـــراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتەکان لە تەکیاندا پەسندکرد.

ئەم جاڕنامەیە ئەوە بەسەر دەوڵەتەکاندا دەسەپێنێت کە ئەرکی گەیشتنی قوربانیان بۆ بەردەم دادوەرێکی بێلایەن مسۆگەر بکەن، هەروەك لەسەریان پێویستیَ دەکات کە لەچوارچێوەی سیستەمە یاساییەکاندا بە جۆریکی مرۆڤانە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن وماف بگێڕنەوە بۆ خاوەن مافەکان، هەروەك لەکاتی پێنەدانەوەی مافەکانیاندا دەبێت دەوڵەت قەرەبوویان بکاتەوە، دەشبێت تەواوی یارمەتی پزیشکی و ماددی و کۆمەڵایەتی و دەروونیان پێبدرێت.

٢- سەبارەت بە سزای لەسێدارەدان، ئەنجوومەنی کۆمەڵایەتی و ئابووری سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان لە ئایاری ساڵی (١٩٨٤)دا لەڕووی مرۆییەوە چەند زەماناتێکی یاسایی دەستەبەرکردووە بۆ پارێزگاریکردن لە مافی ئەو کەسانەی رووبەرووی سزای لەسێدارەدان دەبنەوە.

٣- ئەم زەماناتە جۆرەکانی ئەو تاوانانەی دیاریکردوە کە بە هۆیانەوە سزای لەسێدارەدان دەسەپێنرێت بەسەر مرۆڤەکاندا، چونکە ئەو تاوانانە ترسناکترین و قورسترین تاوانی ناو کومەلگان.

٤- نابێت ئەو کەسانە لەسێدارە بدرێن کە لەکاتی ئەنجامدانی تاوانەکاندا ناکامن(القاصرین) یاخود ئەوانەی کە ئافرەتی دووگیانن، یان ئەو ئافرەتانەی کە تازە منداڵیان بووە، ئەوانەی لە رووی دەروونیەوە گرێ و گرفتیان هەیە.

٥- سەرەڕای ئەو بنەمایانەی لە سەرەوە ئاماژەیان پێکرا، ئەنجوومەنی کۆمەڵایەتی و ئابووری چەند زەمانەتێکی جێبەجێکاریی دیاریکراوی داناوە بۆ جێبەجێکردنی سزای لەسێدارەدان لەو بارانەدا کە سزاکەی تیادا دەسەپێنرێت بە شێوەیەك کە ئەوەندەی دەکرێت لە مەینەتییەکانی کەسی تاوانبارکراو یان حوکمدراو بە سزای لەسێدارەدان کەمبکرێتەوە.

ئەرکی بڕیاردەری تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان تایبەت بە لەسێدارەدان لە دەرەوەی بازنەی یاسا

ئەم دەزگایە لە ساڵی١٩٨٢دامەزراوە بۆ رێگەپێدانی لیژنەی تایبەت بە مافەکانی مرۆڤ تاوەکو کارەکانی بۆ ئەوەی هەموو ئەو لەسێدارەدانە دڕندانانەی لە سەرتاسەری جیهاندا روودەدەن دەستنیشان بکات، هەروەها بۆ دەستکەوتنی ئەو زانیارییانەی کە پێی دەگات، بەتایبەتیش لە حاڵەتی روودانی پرۆسەی

لەسێدارەدانی مرۆڤ لە دەرەوەی بازنەی یاسا، یان لە حاڵەتی بوونی مەترسی لەسێدارەدانی خەڵك بە شێوەیەكی ناڕەوا.

بۆیە بڕیاردەری تایبەتی نەتەوە یەكگرتووەكان بۆ كاروباری لەسێدارەدانی دڕندانە و بەبێ دادگاییكردن لە دەرەوەی چوارچێوەی یاسادا بە یارمەتی كۆمیسیاری باڵای مافەكانی مرۆڤ هەڵدەستێت بە كۆكردنەوەی هەموو ئەو زانیارییانەی پەیوەندیدارن بەو باسەوە و هەڵیاندەسەنگێنێت و پەیوەندی بە دەوڵەتانەوە دەكات بۆ رێگەگرتن لە ئەنجامدانی پرۆسەكانی لەسێدارەدانی بێ دادگایكردن، هەروەها هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی لێكۆڵینەوەی رەسمی و گرتنەبەری رێوشوێنی یاسایی گونجاو، بەتایبەتی لەو كاتانەدا كە بە شێوەیەكی نامرۆڤانە و دوور لە یاسا خەڵكی لەسێدارە دەدرێن.

هەروەها لە ساڵی (١٩٨٥)دا لیژنەی مافەكانی مرۆڤی سەربە نەتەوە یەكگرتووەكان پۆستی بڕیاردەری تایبەتی نەتەوە یەكگرتووەكان بۆ كاروباری ئەشكەنجەدان دامەزراند، بۆ ئەوەی تەواو ئاگاداری مەسەلەی ئەشكەنجەدان و سزادانی قورس و نامرۆڤانە و مایەی روشاندنی كەرامەتی مرۆڤایەتی لە وڵاتەكانی جیهاندا بێت، ئەویش لە رێگای پەیوەندیكردن بە حكومەتەكان

و سـەردانی وڵاتـەکان بـە مەبەسـتی ئەنجامـدانی دانووسـتان و وتووێژکردن لە پێناو ڕێگەگرتن لەو تاوانانەی باسکران، هـەروەك هەڵدەسـتێت بـە وەرگرتنـی سـکاڵاو داواکارییـەکان و کـارکردن لەسـەریان لـە چوارچـێوەی یاسـاکان و پێـوەرە مرۆییەکانـدا. هـەروەها بڕیـاردەری تایبـەت بـە ئەشـکەنجەدان بـەدوای ئـەو سـکاڵایانەدا دەچێت کـە لەگـەڵ حکومەتـە پەیوەندارەکانـدا لـە پێناو پاراستنی ئەو کەسانەی سکاڵاکان بەرزدەکەنەوە پێویستە ئــەوەش بڵــێین کــە دەســەڵاتی بڕیــاردەری تایبــەت بــە ئەشــکەنجەدان و دووبارەکردنــەوەی دەســەڵاتی لیژنــەی بەگژداچوونەوە دژی ئەشـکەنجەدان کـە بـەپێی ڕێککەوتننامـەی بەگژداچـوونەوەی ئەشـکەنجەدان دروسـت بـووە و دەسـەڵاتی بڕیـاردانی تایبـەت بـە ئەشـکەنجەدانی هەیـە و ناوەنـدێکی دەسەڵاتێکی جیهانیە.

## تەوەری دووەم

# جیاکاری ئاینی

بوونی ماف لە ئازادی بیرکردنەوە و دەربڕینی بیروباوەڕی ئایینی بەپێی یاسا و ڕێسا نێودەوڵەتی و ئیقلیمیەکان پارێزراون، بەڵام پیادەکردنی جیاکاری بەهۆی ئایینەوە جاڕنامەیەکی تایبەت بە خۆی هەیە کە نامانەوێت بچینە ناو وردەکارییەکانیەوە. ئازادی ئایینی بە پێی ماددەی (١٨) لەو جاڕنامەیە بەمشێوەیە باسی لێوە دەکات:"هەموو کەسێك، یان هەر تاکێکی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی مافی ئازادی و بیرکردنەوەو ئازادی ئاینی و ویژدانیی هەیە، ئەم مافەش ئازادی بۆ گۆڕینی ئاینەکەی و بیروباوەڕەکەی پێداوە لە ڕووی نیشاندان و پەیڕەوکردنی خواپەرستی و پەیڕەوکردنی ڕێوڕەسمە ئاینییەکان و مافیشی لە فێربووندا هەیە بە تەنها خۆی یان لەگەڵ کۆمەڵدا و بە شێوەیەکی ئاشکرا دەبێت". هەروەها ئەم مافانە بە پێی ماددەی(١٨) لە ڕێکەتننامەی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکان و ماددەی(٨) لە

میساقی ئەفەریقی بۆ مافەکانی مرۆڤ و گەلان، هەروەها بە پێی ماددەی(١٢) لە رێکەوتننامەی ئەمریکی بۆ مافەکانی مرۆڤ و ماددەی(٩) لە رێکەتننامەی ئەورووپی بۆ مافەکانی مرۆڤ چەسپێنراون و کارپێکردنیان بەسەر دەوڵەتە ئەندامەکاندا سەپێنراوە".

**یاسای نەهێشتنی هەموو جۆرەکانی جیاکاری رەگەزیی و دەماگیری بەهۆی ئایین و بیروباوەڕەوە**

أ- مافی بەدەستهێنانی ئازادی ئایینی و ئازادی بیروڕا لە چواچێوەی ماددەی(١)ی ئەم یاسایەدا ئاماژەی بۆکراوە بەهەمان ئەو زاراوانەی کە لە دەقی ماددەی(١٨)ی جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤدا هاتووە.

ب- ماددەی(٢) لەم یاسایە دەڵێت" نابێت هیچ کەسێك لە لایەن هیچ دەوڵەتێك یان هەر دامەزاوەیەك یان هەر کۆمەڵە کەسێکەوە رووبەروی جیاکاری و رەگەزپەرستی بکرێتەوە، بەهۆی جیاوازی ئایینی یان بیروڕاوە".

ت- ماددەی(٣)ی ئەم یاسایە، جیاکاری لەسەر بناغەی ئایین و بیروباوەڕ بە هەموو شێوەیەکانیەوە رەتدەکاتەوە،

چـونکە ئـەوە بـە سـوکایەتیکردن بـە بـەهای مرۆڤایـەتی و پێـشێلکردنی مافـەکانی مـرۆڤ و ئازادییـە گـشییەکان دەدرێتـە قەڵەم.

ماددەی(٤)ی ئەم یاسایە دەڵێت" دەبێت سەرجەم دەوڵەتان رێوشوێنی کاریگەر بگرنەبەر لـە پێنـاو ریشەکێشکردنی هـەموو جۆرە جیاوازیکردنێك بەهۆی ئـاین یـان بیروبـاوەڕەوە، هـەروەك پێویستیشە لەسەریان یاسا دابڕێژن و لەکاتی پێویستدا هەنـدێك لەو یاسایانەش هەڵبوەشێننەوە کە بانگەشـە بـۆ جیاکـاری لـەم جـۆرە جیاکاریانـە دەکـەن کـە پێـچەوانەی یاسـا و عورفـە نێودەوڵەتییەکانە".

## تەوەری سێیەم

## ئافرەتان و منداڵان و جیاوازی کردن

بەگشتی دوو ڕێسا هەیە کە بە تایبەتی چارەسەری جیاکاری دژی ئافرەتان دەکەن، هەروەك لەو یاسا و ڕێسایانەی تردا کە پەیوەندیدارن بە نەهێشتنی جیاکاری ڕەگەزی و جیاکاری ئایینی، بۆیە ئەم دوو ڕێسایەی تایبەت بە ئافرەتان دارێژراون تەواوکەری ئەو بنەمایانەن کە پەیوەندیدارن بە چەمکی جیاکاری لە چوارچێوەی هەموو یاساو ڕێسا نێودەوڵەتی و ئیقلیمیەکانی تایبەت بە مافەکانی مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی:

١- ماددەی(١) لە یاسای تایبەت بەجیاکاری دژی ئافرەتان هەموو جۆرە جیاکارییەك دژی ئەو توێژەی کۆمەڵگە بە سوکایەتیکردن بە بەهاکانی مرۆڤایەتی دەداتە قەڵەم.

٢- ماددەی(٢) لە یاسای نەهێشتنی جیاکاری دژی ئافرەتان داوا دەکات هەموو ئەو یاسا و عورف و سیستەمانە هەڵبوەشێنرێنەوە کە بە شێوەیەك لە شێوەکانی جیاکاری دژی ئافرەتان دادەنرێت.

٣- ماددەی(١٠) لە یاسای نەهێشتنی توندوتیژی دژی ئافرەتان داوادەکات ڕێوشوێنی گونجاو بگیرێتەبەر بۆ ئەوەی ئافرەتان وەك پیاوان مافی یەکسانیان هەبێت لە ژیانی بۆتەی ئابووری و کۆمەڵایەتیدا، بە تایبەتیش مافی ئافرەتان لە کارکردن و ئازادی هەڵبژاردنی جۆری پیشە و بەرزکردنەوەی پلەکانیان لە کارو پیشەکانیاندا، هەروەها بەپێدانی مافی ئافرەتان لە بەدەستهێنانی راهێنانی پیشەیی و دامەزراندندا.

٤- هەروەها بەپێی ماددەی(٢)ی یاساکە پێویستە دەوڵەتە ئەندامەکان لە ڕێگەی دوورکەوتنەوە لە گرتنەبەری هەر کارێکی جیاکاری و ناشایستە دژی ئافرەتان بیسەلمێنن کە لە دژی جیاکاری دەوەستنەوە، دەشبێت ئەو ئەنجامە لە دەسەڵاتی دامودەزگا گشتییەکاندا رەنگبداتەوە و لەگەڵ ئەم پابەندییە نێودەوڵەتیەدا کۆك بێت.

٥- برگەی(ب) لە ماددەی(١١)ی ئەم یاسایە دەڵێت "پێویستە لەسەر دەوڵەتە ئەندامەکان مافەکانی ئافرەتان لە بەدەستهێنانی دەرفەتی کارکردن بە یەکسانی وەك پیاوان بەدەستبهێنێت".

دوو یاسـای نێودەوڵـەتی تایبـەت هەیـە ئامـاژە دەکـەن بـۆ ڕێگـەگرتن و نەهێـشتنی جیـاوازی کـردن لــە دژی منــداڵان، ئەوانیش:

١- پەیماننامەی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە مـەدەنی و سیاسییەکان:

کە بڕگەی(١) لە ماددەی(٢٤)ی ئەم یاسایە دەڵێت" هـەموو منـداڵێك بـەبێ جیـاوازیکردن بـەهۆی ڕەگـەز، ڕەنـگ، ئیتنیـك، زمان، ئایین، ڕەچەڵەکی نەتەوایەتی یان کۆمەڵایەتی یان بەهۆی بنەچەیەوە، مافی بەسەر خێزان و کۆمەڵگـە و دەوڵەتـەوە هەیـە کـە کـار بکـەن لــە پێنـاو پارێزگـاری لێکردنێـدا لەبەرئـەوەی کەسێکی ناکامە".

٢- ڕێکەوتننامەی مافەکانی منداڵ :

هـەموو یاسـا نێودەوڵەتییـەکانی تـری تایبـەت بـە پاراسـتنی مافـەکانی مـرۆڤ پێـداگری لەسـەر پاراسـتنی مافـەکانی منـداڵان دەکەنەوە، بڕگەکانی دیباجەی ڕێکەوتننامـەی مافـەکانی منـداڵ ئامــاژە دەکــات بــۆ دەســتەبەرکردنی مــافی یەکــسان و بــێ دەستکاریکردن بۆ سەرجەم تاکەکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی.

هــەروەها مــاددەی(١) لــەم ڕێکەوتننامەیــە بەمــشێوەیە پێناسەی منداڵ دەکات" هـەر مرۆڤێـك کـە تەمـەنی(١٨) سـاڵی تەواو نەکردبێت بە منداڵ یـان نەوجـەوان دادەنرێـت و بڕگـەکانی ئەم یاسایەی بەسەردا جێبەجێدەکرێت".

ماددەی(٢) ی ڕێکەوتننامەی مافەکانی منداڵ دەڵێت"دەبێت دەوڵــەتانی ئەنــدام ڕێــز لــەم مافــە ڕوونکراوانــەی نــاو ئــەم ڕێکەوتننامەیە بگرن و بەبێ جیاوازی بـۆ هـەموو ئـەو مندالآنـەی دابین بکەن کە لـەژێر سـایەی یاسـا و دەسـەلآتیاندا دەژیـن، بـە چاوپۆشی کردن لە ڕەگەزی منداڵەکە و ڕەگەزی دایـك و بـاوکی، یــان ڕەنگیــان، یــان زمــان و ئــاین و بــیرووڕای سیاســیان، یــان ڕەچەڵەکی ئیتنی و نەتــەوەیی و کۆمەلآیـەتیان یـان سـەروەت و سامانیان، یان هەژاری و نەداریان، یـان شـوێنی لـەدایکبوونیان، یان لەبـەر هـەر هۆکـارێکی دیکـە. بۆیـە ئـەرکی دامودەزگاکـانی دەوڵەتە هەموو ئەو ڕێوشوێنانە بگرنەبەر بۆ پارێزگـاریکردن لـە منــدالآن و دوورخــستنەوەیان لـە هـەموو جۆرەکـانی جیاکـاری و سزادان، بەهۆی ئەو فاکتەر و هۆکارانەوە کە باسمان لێوەکردن.

**سنووری دەستگیرکردنی نەوجەوانان:**

(١٠) بنەما لـە بنـەما نموونەییـەکانی نەتـەوە یـەکگکرتووەکان ئاماژە دەکەن بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری دادوەریی نەوجـەوانان، ئەم بنەمایانەش بە( بنەماکانی پەکین) ناسـراون. وا لـەخوارەوە هەندێك لەو بنەمایانە دەخەینەڕوو:

١- لـەکاتی دەسـتگیرکردنی هــەر نەوجەوانێکـدا، پێویـستە یەکسەر دایك و باوکی یان بەخێوکەرەکەی لێ ئاگادار بکرێتەوە.

٢- هەر دادوەرێك یان هەر بەرپرسێکی دادوەریـی رەسمـی و تایبەتمەند، یان دەزگایەکی تایبەتمەند بەبێ دواخستن پێویـستە بڕوانێتە رێوشوێنی ئازادکرنی نەوجەوانە دەستگیرکراوەکە.

٣- پێویستە ئەو لایانەنانـەی کـە دەسـەڵاتی جێبـەجێکردنی یاساکانیان پیسپێردراوە لە پەیوەندی بەردەوامدابن لەگـەڵ ئـەو نەوجەوانـەدا کـە تاوانبـارکراوە بەشـێوەیەك کـە کایـەی یاسـایی نەوجەوان رێـزی لێبگیرێـت. هـەروەها دەبێـت رێگـە بگیرێـت لـە ئازاردانی و ناوەرۆکی دۆسیەی کێشەکەی بەهەند وەربگیرێت.

رێکەوتننامەی مافەکانی منداڵ لە ماددەی(٣٧ب)دا بـەمجۆرە باسـی دەسـتگیرکردنی نەوجـەوان دەکـات:" هـیچ منـداڵێك بـە شێوەیەکی نایاسایی و درندانە لە ئازادییەکانی بێبەری ناکرێـت،

بۆیە دەبێت دەستگیرکردن و بەندکردن یان ڕاگرتنی منداڵان و نەوجەوانان بەپێی یاسا بێت و دەشبێت هێشتنەوەی بە ڕاگیراوی وەك دواپەناگە سەیر بکرێت و بە گشتی بۆ کەمترین ماوەش بێت" .

## تەوەری یەکەم

# پێوەرە نێودەوڵەتییەکانی
# تایبەت بە لێکۆڵینەوەکانی پۆلیس

بنەما سەرەکییەکانی:

- لەکاتی بەڕێوەچوونی لێکۆڵینەوەکان و وەرگرتنی وەڵامی شایەدحاڵ و قوربانی و گومانلێکراوەکاندا، پێویستە رەچاوی مافەکانی مرۆڤ بکرێت.
- هەموو تاکێك مافی پاراستنی تاکەکەسی هەیە.
- هەموو تاکێك مافی ئەوەی هەیە بە شێوەیەکی دادپەروەرانە دادگایی بکرێت.
- هەر کەسێکی تاوانبارکراو بە ئەنجامدانی تاوانێك بە بێتاوان دادەنرێت تا ئەو کاتەی لە دادگایەکی دادپەروەرانەدا تاوانەکەی بەسەردا ساغدەبێتەوە.
- نابێت بە شێوەیەکی نامرۆڤانە دەستوەربدرێت لە ژیانی تایبەتی کەسێك یان کاروباری خێزانی و نیشتەجێبوون و پەیوەندییەکانی هیچ مرۆڤێك.

- نابێت هیچ کەسێك ناچاربکرێت بە ئەنجامدانی کارێك کە ناوبانگ و شەرەف و کەرامەتی لەکەدار بکات.

- نابێت هیچ گوشارێکی جەستەیی یان فیکری لە دژی گومانلێکراو یان شایەتحاڵ یان قوربانییەکان پەیڕەو بکرێت لە پێناوی بەدەستهێنانی زانیاریدا.

- ئەشکەنجەدان و هەموو جۆرەکانی تری مامەڵەکردنی نامرۆڤانە و کەرامەت رووشێن قەدەغەیە.

- پێویستە شایەتحاڵ و قوربانییەکان بەڕێزەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت و چاودێری بکرێن.

- دەبێت لە هەموو کاتێکدا نهێنییەکان بپارێزرێن و بە وردی مامەڵە لەگەڵ زانیارییە هەستیارەکاندا بکرێت.

- نابێت کەسێك بەزۆر ناچار بکرێت دان بنێت بە تاوانێکدا یان شایەتی بدات لە دژی خۆی.

- نابێت لێکۆلینەوەکان لە دەرەوەی یاسا پەیڕەوکراوەکاندا ئەنجامبدرێت.

- هەر جۆرە چالاکی و لێکۆڵینەوەیەکی ناشایستە و نامرۆڤانە بە بێ پاساو کارێکی ڕێگەپێنەدراوە.

١- لێکۆڵینەوە لە تاوانەکان یەکەم هەنگاوی سەرەکییە بۆ هێنانـــەدی دادوەری و ئـــەو ئامرازەیـــە کـــە بەهۆیـــەوە تاوانبارکراوەکـــان راپێـــچی دادگاکـــان دەکـــرێن و لەوێـــدا تاوانباربوونیـــان یـــان بێتاوانیـــان دەردەکـــەوێت. هـــەروەها لێکۆڵینەوە هەنگاوێکی بنەڕەتیە بۆ دەستەبەرکردنی خۆشی بۆ کۆمەڵگا، چونکە ئەنجامـدانی تـاوان دەبێتـە هـۆی دروسـتبوونی خەم و پەژارەی خەڵك و پەکخستنی گەشەپێدانی کۆمەڵایـەتی و ئـابووری تووشـی شـۆك دەكـات، لەبـەر ئـەوە ئەنجامـدانی لێکۆڵینەوەیەکی تاوانکاریی کاراو یاسایی و ئەخلاقی یەکێکە لـە لایەنە هەرە گرنگەکانی کارکردنی دامودەزگاکانی پۆلیس.

٢- بـە گـشتی لێکۆڵینـەوە لـە تاوانـەکان بـە چـالاکیەکی شایستە و دیاری پۆلیس دەژمێردرێت، لەگەڵ ئەوەشدا سەرجەم پێوەرە پەیوەندارەکان بەکاری پۆلیس گرنگە تیایانـدا رەچـاوی مافەکانی مرۆڤ بکرێت.

٣- لەکاتی بەڕێوەچوونی لێکۆڵینەوەکاندا لەوانەیە پـۆلیس دەسەڵاتی دەستگیرکردن بەکاربهێنێت، چونکە بەپێی یاسا ئـەو دەسەڵاتەی پێدراوە، بەڵام پێویستە تـەنها لـەکاتی پێویـستدا و پاڵپشت بەبوونی رێگەپێـدانێکی یاسـایی نـەبێت ئـەو دەسـەڵاتە

پیادە نەکرێت. دەشکرێت دەستبەسەرکردنی ئەو کەسانەی گومانیان لێدەکرێت بە ئەنجامدانی تاوانێك بکرێتە بابەتی لێکۆڵینەوەکان، بەڵام لەم حاڵەتانەدا دەبێت بە شێوەیەکی مرۆڤانە مامەڵە لەگەڵ ئەو کەسانەدا بکرێت. هەندێك جار لەوانەیە بۆ دەستگیرکردنی گومان لێکراوێك پەناببرێتە بەر بەکارهێنانی هێز یان دەستبەسەرکردنی کەسەکە، بەڵام لەمەشیاندا لەکاتی زۆر پێویستدا نەبێت، نابێت هێز بەکاربهێنرێت، واتە بەو ئاستەی کە هێنانەدی ئامانجی یاسایی لێکۆڵینەوەکان دەیخوازێت.

٤- بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوە لە تاوانەکاندا بەپێی پێوەرو بنەما ئەخلاقی و مرۆییەکان بچێتە ڕێوە، دەبێت ڕێز لە کەرامەتی مرۆڤایەتی و تەواوی مافەکانی مرۆڤ بگیرێت و تۆمەتبارکراوەکان  ڕووبەرووی یاسا بکرێنەوە. لێکۆڵینەوە لە تاوانەکان لە کۆمەڵگا دیموکراتییەکاندا هەمیشە لە دوای ئەوەوە دێت کە ئەو کەسانە ڕووبەرووی حوکمی کۆمەڵگا دەکرێنەوە، پاشان دەبرێنە بەردەمی یاسا بۆ دەرخستنی تاوانەکانیان.

## تەوەری دووەم

# لایەنە گشتییەکانی مافەکانی مرۆڤ و لێکۆڵینەوەکانی پۆلیس

- گریمانەی ئەوەی کە هەموو تاوانبارکراوەکان بێتاوانن.
- پێدانی ماف بە هەموو تاوانبارکراوەکان لە دادگایکردنێکی دادوەرانە.
- ڕێزگـرتن لـە بـەهاو کەرامـەت و تایبەتمەنـدێتی هـەموو تاکەکانی کۆمەڵگا.

هەموو ئەو پێوەرو بنەمایانەی لە سەرەوە باسکران لـە یاسا و ڕێـساکانی مـافی مرۆڤـدا بـە وردی باسـیان لێـوەکراوە، بـە تایبەتیش گریمانەی بێتـاوانی کەسـەکان تـا ئـەو کاتـەی بـەپێی یاسـا تۆمەتـەکانیان دەسـەلمێنرێت، هـەروەها مـافی بەدەسـتهێنانی دادگـایکردنێکی دادپەروەرانـە و مـاف لـە ڕێگەنەدان بە هیچ کەس و لایـەك کـە بەشێوەیەکی نامرۆڤانـە و دوور لـە یاسـا دەسـتوەربداتە کاروبـاری تایبـەتی و ژیـانی مرۆڤەکانەوە.

أ- گریمانەی بێتاوانی:

١- ئـەم مافـە بـە پێـی برگـەی(١) لـە مـاددەی(١١)ی جاڕنامەی جیهانی مافـەکانی مرۆڤدا جـەختی کراوەتەسـەر کـە دەڵێت" هەموو کەسێکی تاوانبارکراو بە ئەنجامـدانی تاوانێـك تـا ئەو کاتـەی لـە دادگـاییکردنێکی ئاشـکرادا تاوانەکـەی بەسـەردا دەســەپێنرێت بــە بێتــاوان دادەنرێــت بــە مــەرجێك هــەموو زەمانەتێکی پێویستی بۆ دابین بکرێت بەمەبەسـتی بـەرگریکردن لە خۆی".هەروەها ئەم مافە بە پێـی پەیماننامـەی نێودەوڵـەتی تایبــەت بەمافــە مــەدەنی و سیاســییەکان لــە برگــەی(٢)ی ماددەی(١٤)دا هاتووە، سەرەڕای ئەوەش میساقی ئەفەریقی بـۆ مافەکانی مرۆڤ و گەلان و رێکەوتننامەی ئەمەریکی بۆ مافـەکانی مرۆڤ و رێکەوتننامەی مافی مرۆڤی ئـەوروپی گرنگیـان بـە مـافی گریمانەی بێتاوانی داوە. لـە ئـەنجامی ئـەم بنەمایانـە دوو خـاڵی گرنگ بەدیدەکرێت:

- ناکرێت تاوانبارکردن یان بێتاوانبوون دیاری بکرێت، تـەنها لـە رێگـەی دادگاییـەکی دادپەروەرانـەوە نـەبێت، واتـە لـەدوای دادگاییەك کە بەشێوەیەکی یاسایی و تەندروست بەڕێوەبـچێت و

تیایدا ڕێگە بەکەسی تاوانبارکراو بدرێت داوابکات داکۆکی و بەرگری لێبکرێت.

- مافی تاکەکەس لە وتنی بێتاوانی تا ئەو کاتەی تاوانبارکردنی دەسەلمێنرێت، مافێکی بنەڕەتیە بۆ دەستەبەرکردنی دادگاییکردنی دادپەروەرانە.

٢- گریمانەی بێتاوانی لە پروسەی لێکۆڵینەوەدا کاریگەرییەکی گرنگ دەگرێتەخۆ ئەویش ئەوەیە کە "پێویستە هەموو ئەو کەسانەی لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت وەکو کەسانی بێتاوان سەیربکرێن ئیتر ئایا دەستگیرکراو بن یان دەستبەسەرکراو بن یاخود لەکاتی لێکۆڵینەوە کردن لەگەڵیاندا ئازادبن".

٣- مافی بەدەستهێنانی دادگایکردنێکی دادپەروەرانە لە ماددەی(١٠)ی جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤدا باسی لێوەکراوە کە دەڵێت" هەموو مرۆڤێك بە یەکسانی لەگەڵ ئەوانی تردا مافی هەیە کە کێشەکەی ڕووبەڕووی دادگایەکی سەربەخۆ و بێلایەن بکرێتەوە و دادگایکردنەکەش ئاشکرا بێت بۆ ئەوەی پابەندی و مافەکانی لە هەر تۆمەتێکی سزاییدا کە ئاڕاستەی دەکرێت، پارێزراو بێت". ئەم مافە بەپێی پەیماننامەی

نێودەوڵـــەتی تایبـــەت بەمافـــە مـــەدەنی و سیاســـییەکان لـــە ماددەی(١٤)دا هاتووە، سەرەڕای ئەوەش میساقی ئەفەریقی بۆ مافەکانی مرۆڤ و ڕێکەوتننامەی ئەمەریکی بۆ مافـەکانی مـرۆڤ و ڕێکەوتننامـــەی مـــافی مرۆڤـــی ئـــەورووپی گرنگیـــان بـــە مـــافی بەدەستهێنانی دادگاییکردنێکی دادپەروەرانە داوە.

٤- بـۆ ئـەوەی کەسـەکە بتوانێـت بگاتـە بەدەسـتهێنانی دادگـاییکردنێکی دادپەروەرانـــە بەرامبـــەر هـــەر تۆمـــەتێك کـــە ئاڕاســـتەی کـــراوە، دەبێـــت ئەنجامـــدانی لێکۆڵینـــەوەکان بـــە شێوازێکی مرۆڤانە و بەپێی ئەو بنەما یاساییانە بەڕێوەبچێت کە پرۆســـەی لێکۆڵینـــەوەکان ڕێکدەخـــەن، وەك( کۆکردنـــەوەی بەڵگـەکان، وەرگرتنـــی ئیفـادەی گومانلێکراوەکـان، وەرگرتنـــی شایەتی ڕاست و دروست لەبەردەم دادگادا).

٥- ســـەرجەمی ئـــەم مافانـــە پاڵپـــشت بـــە پابەنـــدبوونی کارمەنـدانی ڕاسـپێردراو بـە جێبـەجێکردنی یاسـاکان دێنـەدی، چـونکە پێویـستە لەسـەریان لـەکاتی جێبـەجێکردنی ئـەرك و دەسـەڵاتەکانی دەسـتگیرکردندا ئاگایـان لـەم بنـەما یاسـایی و مرۆییانـــە بێـــت و پـــشتگوێیان نەخـــەن و پـــەیڕەوییان بکـــەن. نموونەشمان لەسەر ئەمە ئەوەیە کە لە بڕگەی(٢)ی مـاددەی(٩)

لە پەیماننامەی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکاندا هاتووە دەڵێت" هەر کەسێك کە دەستگیر دەکرێت پێویستە هۆکاری دەستگیرکردنەی پێڕابگەیەنرێت لەگەڵ هەر تۆمەتێکدا کە ئاڕاستەی کراوە".

٦- لەکاتی دەستگیرنەکردنی کەسێکدا کە خراوەتە ژێر لێکۆڵینەوەوە، دەبێت یەکسەر ئەو کەسە لەو تۆمەتەی خراوەتە پاڵی ئاگادار بکرێتەوە.

٧- ڕوون و ئاشکرایە کە سروشتی لێکۆڵینەوەکان کاردەکاتە سەر ئەو ماوە زەمەنییەی کە دەکرێت تیایدا کەسەکە لەبارەی تۆمەتەکەیەوە ئاگادار بکرێتەوە. لەو بارانەشدا کە زۆر ئاڵۆزن، پێدەچێت ئەم کارە کاتێکی زۆرتری بوێت بە بەراورد لەگەڵ ئەو بارانەدا کە کەمتر ئاڵۆزن، بەڵام لە هەردوو بارەکەدا هەمان پێوەر جێبەجێدەکرێت، ئەویش ئەوەیە تادەتوانرێت زووتر کەسەکە ئاگادار بکرێتەوە.

ب- ماف لە چوونە بەردەمی دادگا بەبێ سستی نواندن:

١- ئەم مافە مانای ئەوەیە کە پێویستە جێبەجێکردنی کاری لێکۆڵینەوە بە خێرایی و کارایی ئەنجامبدرێت.

٢- لەوانەیە ئاستی ئالۆزی کێشەکە کاربکاتە سەر کاتی دیاریکراو بۆ رەوانەکردنی تۆمەتبار بۆ بەردەم دادگا، هەروەها دەشکرێت درێژی ماوەی لێکۆڵینەوە بکەوێتە ژێر کاریگەری چەند فاکتەرێکی تری وەکو( گرفتی نەبوونی شایەت و رەفتاری ئەو کەسەی لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا دەکرێت)، بەم پێیەش دەبێت بەبێ هیچ دواکەوتنێکی بێ پاساو دادگاییکردنەکە ئەنجامبدرێت.

٣- نابێت شێوازی بەڕێوەبردنی لێکۆڵینەوە لەلایەن پۆلیس بکرێتە هۆیەك بۆ پشتگوێ خستنی ئەم زەمانەتە یاساییانە.

٤- لەکاتی بەڕێوەچوونی لێکۆلێنەوەدا لەوانەیە دەزگاکانی پۆلیس رووبەرووی چەند شایەتحاڵێکی تاوانەکە ببنەوە کە بەڵگەکانیان دژی ئەو کەسەی خراوەتە ژێر لێکۆڵینەوەوە، پاڵپشتی کێشەکە ناکات. ئەوەی ئاشکرایە لەوانەیە ئەم بەڵگانە بەسبن بۆ ئاماژەکردن بۆ تاوانبارکردنی کەسی گومانلێکراو بە ئەنجامدانی تاوانێك کە لە واقیعدا ئەو کەسە ئەنجامدەری تاوانەکە نیە، بۆیە ئەوە دەبێتەهۆی وەستاندنی لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئەم کەسەدا.

٥- لە لایەکی ترەوە لەوانەیە ئەم بەڵگانە ببنەهۆی روونبونەوەی راستی کێشەکە و ئاڕاستەکردنیان لە دژی کەسی

گومانلێکراو بەئەنجامدانی تاوانەکە، بۆیە بەڵگەی تەواو لەبەردەستدا دەبێت بۆ سەلماندنی تاوانبارکردنی کەسی گومانلێکراوو راپێچکردنی بۆ بەردەمی دادگا، بە مەرجێك ئەو شایەتحاڵەی کە دەتوانێت چەند بەڵگەیەك بخاتە بەردەستی دادگا بۆ لاوازکردنی کێشەکە لە دژی کەسی تاوانبارکراو شایەتحاڵێکی نەفی بێت، بۆیە دەبێت ئەم شایەتحاڵە لەکاتی دادگاییکردنی تاوانبارکراودا ئامادەبێت بۆ وەڵامدانەوە.

پ- ناچارنەکردنی کەسێك بەزۆر بۆ شایەتیدان لە دژی خۆی:

١- ئەگەرچی ئەم بنەمایانە کەسی تاوانبارکراو لەکاتی دادگاییکردندا دەپارێزن، بەڵام ئەوە لە قۆناغێك یان لە قۆناغەکانی لێکۆڵینەوەی پۆلیس لەگەڵ کەسی گومانلێکراودا کاریگەری خۆی دەبێت.

٢- هەندێك لەم بنەمایانە ئامانجیان ئەوەیە کە رێگەبگرن لە ناچارکردنی گومانلێکراوان بۆ داننان بە تاواندا بەزۆر، ئەگەر هاتوو گومانلێکراو رووبەرووی ناچارکردنێکی نایاسایی و نا ئەخلاقی کرایەوە بۆ ئەوەی لە کاتی لێکۆڵینەوەدا بە زۆر دان بە ئەنجامدانی تاوانێکدا بنێت، ئەوا ئەم رفتارە تەواو دژی ئەو

مافانەیـە کـە بـۆ پاراسـتنی کەسـە تاوانبارکراوەکـان لـەکاتی دادگاییکردنیاندا دارێژراون.

د- دەسـتێوەردان لـە تایبەتمەندییـەکان بـە شـێوەیەکی ناڕەوا:

١- تایبەتمەندێتی تاکـەکان و نـاو و ناوبـانگ و شـەرەفیان، بەپێی بەندەکانی جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤ بـە تایبـەتی ماددەی(١٢)ی جاڕنامەکە پارێزراون کە دەڵێـت" نابێـت دەسـت لە ژیانی تایبەتی و کاروباری خێزانی و شوێنی نیـشتەجێبوون و پەیوەندییەکانی هیچ کەسێك وەربدرێت بـە شـێوەیەکی نـاڕەواو نامرۆڤانە، هەروەها ڕووبەڕووی کارێك نەکرێتەوە کـە ناوبـانگ و کەرامەتی لەکـەدار بکرێـت، هـەموو کەسـێکیش مـافی هەیـە لـە لایـەن یاسـاوە پارێزگـاری لێبکرێـت لـەمجۆرە دەسـتوەردان و ناچارکردنانە".

٢- ڕێکەوتننامـەی ئـەوروپی بـۆ مافـەکانی مـرۆڤیش لـە چوارچێوەی ماددەی(٨)دا جەختی لەسەر ئـەم مافـە کردۆتـەوە بەمشێوەیە:( دەسەڵاتە گشتییەکان بە پێـی ڕێکەپێدانی یاسـاو لـەکاتی پێویـستیدا نـەبێت لـە کۆمەڵگایـەکی دیموکراتیـدا بـە بیـانووی پاراسـتنی بەرژەوەنـدی ئاسایـشی نیـشتمانی یـان

سەلامەتی گشتی و خۆشگوزەرانی ئابووری وڵات نەبێت، یان لە پێناو ڕێگەگرتن لە ڕوودانی پاشاگەردانی و تاوانکاری و پاراستنی تەندروستی و دابوونەریت و ئەخلاق و مافی ئازاردانی خەڵکانی تردا نەبێت، بۆیان نیە پەیڕەوی ئەم کارە بکەن).

٣- کاریگەرییەکانی ئەم حوکمانە بەسەر ڕێڕەوی لێکۆڵینەوە لە تاوانەکان روونە، بۆ نموونە وەك کارەکانی پشکنین، بەتایبەتیش پشکنینی تاکەکان و مامەڵەکانیان و ئۆتۆمبیل و کەلوپەلەکانی دیکەیان. هەروەها ڕێگرتن لەو پەیوەندی و نامە گۆڕینەوە تەلەفۆنیانەی کە ئەنجامی دەدەن. بۆیە زۆر پێویستە هەموو ئەم کارانە بە جۆرێکی یاسایی تۆکمە و لەکات و ئاستی پێویستیدا بەپێی ئامانج و مەبەستە یاسایی و ڕەواکان بۆ جێبەجێکردنی یاساکان ئەنجامبدرێت.

٤- پارێزگاریکردن لە تایبەتمەندییەکان بەپێی ماددەی(٤) لە یاسای بنەماکانی رەفتارکردنی کارمەندانی راسپێردراو بە جێبەجێکردنی یاساکان جەختیان لەسەر کراوەتەوە، بەمجۆرە: ( کارمەندانی راسپێردراو بە جێبەجێکردنی یاسا پێویستە لەسەریان پارێزگاری لەو نهێنییانە بکەن کە لەبەردەستیاندایە، واتا هەموو ئەو مەسەلانەی کە سروشتێکی نهێنیان هەیە

مادامەکی لەگەڵ ئەدای ئەرك و کارەکانیان و پێویستیەکانی دادوەری پێچەوانەدا نابێت). شیکردنەوەی ناوەڕۆکی ئەم ماددەیە واتا ماددەی(٤)ی یاساکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە کارمەندانی راسپێردراو بەجێبەجێکردنی یاسا بەحوکمی کارەکەیان چەند زانیارییەکان دەست دەکەوێت کە لەوانەیە زیان بەناوبانگ و کەرامەتی خەڵك بگەیەنێت، بۆیە رێنماییەکان هۆشداری ئەوە دەدەن کە پێویستە لەکاتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو زانیاریانەدا زۆر وردبن، چونکە درکاندنی ئەو زانیارییانە بۆ هەر مەبەستێکی تر جگە لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانیان و خزمەتکردنی دادپەروەری ئەوپەڕی مەسەلەیەکی ناڕەوا و نابەجێیە.

٥- درکاندنی ناڕەوای زانیارییە نهێنیەکان کە زیان بە کەرامەت و ناوبانگی کەسەکان دەگەیەنێت، بە دڵنیاییەوە بریتیە لە پێشێلکردنی بنەماکانی جاڕنامەی گەردوونی مافەکانی مرۆڤ و هەردوو رێکەوتننامەی ئەوروپی و ئەمریکی بۆ مافەکانی مرۆڤ کە پێشتر ئاماژەیان بۆ کراوە.

## تەوەری سێیەم

# لایەنە تەکنیکییەکانی لێکۆڵینەوەکان

ئەگەر لێکۆڵینەوەکانی پۆلیس کاریگەربن لەسەر بناغەی ڕێزگرتن لەکەرامەتی مرۆڤایەتی و بنەما یاساییەکان بەڕێوەببرێن، لەو پرۆسەیەدا تا ئاستێکی زۆر لەسەر ئەم خاڵانە بەندە:

- دەستەبەرکردنی سەرچاوە زانستی و تەکنیکیەکان و بەکارهێنانیان بەشێوەیەکی ژیرانە.
- بەجێهێنانی توانا و لێهاتوویەکانی کاری سەرەکی پۆلیس بەشێوەیەکی چڕوپڕ.
- بوونی مەعریفەو وشیاری تەواوی ئەو کەسانەی لێکۆڵینەوە لەگەڵ تاوانبارکراو و گومانلێکراوەکاندا دەکەن.
- گوێڕایەڵی بۆ ئەو بنەما یاساییانەی کە لە لێکۆڵینەوە جینائیەکاندا پەیڕەو دەکرێن، لەگەڵ کارکردن بە پێوەرەکانی مافی مرۆڤ.
- بەکارهێنانی ئامرازەکانی پشکنینی شوێنی ئەنجامدانی تاوانەکان و پشکنینی ئەو ماددە و کەلوپەلانەش کە لەشوێنی

تاوانەکەدا دەدۆزرێنەوە، یان هەر ماددەو کەلو پەلێکی دیکە کە دەکرێت سوودیان لێوەربگیرێت.

- بەکارهێنانی ئامرازەکانی تۆمارکردن و بەراوردکردنی زانیارییەکانی کە پشکنینیان بۆ دەکرێت لەکاتی لێکۆلینەوەکاندا. هەروەك ئەنجامدانی لێکۆلینەوەکان بەشێوەیەکی بەرفراوان پێویستی بەبوونی کارئاسانی تەکنیکی و کۆمپیوتەری هەیە لە پێناو بە ئەنجامگەیاندنی لێکۆلینەوەکان.

- چاوپێکەوتنی شایەتحاڵەکان و گومانلێکراوەکان( ئەم لێهاتوویانە پێویستیان بە پەیرەوکردنی شێوازێکی مامەڵە کردنی جیاواز هەیە).

- پشکنینی سەرجەم شوێن و پێگەکان، وەکو بیناکان و شوێنە کراوە گشتیەکان و ئوتۆمبیلەکان و پشکنینی کەسە گومانلێکراوەکان بەتایبەتی( ئەم جۆرە پشکنینانەش پێویسییان بە گرتنەبەری شێوازی مامەڵەکردنی جیاواز هەیە).

- لە چوارچێوەی بوونی وشیاری و مەعریفە لەلای لێکۆڵەرەوەکانی پۆلیسدا دەبێت ئەم ئامرازانەی خوارەوە دەستەبەربکرێت:-

١-ئـــەو ئـــامراز و پێداویـــستیانەی کـــە بـــۆ ئەنجامـــدانی کاروبارەکان پێویستە بۆ بەڕێوەچوونی لێکۆڵینەوەکان فەراهـەم بکرێت.

٢-سـەلیقە و توانایـە سـەرەکییەکانی پـۆلیس پێویـستن بـۆ هاوکاریکردنی لێکۆڵەرەوەکان و دەبێت دەستبەربکرێن.

٣-ئـــەو دەســـەڵاتە یاســـایی و پێـــوەرە ئەخلاقیانـــەی کـــە پێویستە رەچاوبکرێت بەگشتی بەدەستهێنانی پـسپۆڕییەکانی پۆلیس و ئاستەکانی وشـیاری لـەلای لێکۆڵـەرەوەکانی پـۆلیس، هـــەموویان چـــەند ئـــامرازێکن کـــە کارمەنـــدانی راســـپێردراو بـــە جێبـــەجێکردنی یاســـا پـــشتیان پێدەبەســـتن و گـــرنگن بـــۆ کـــاری حکومـــەت و دامودەزگاکـــانی جێبـــەجێکردنی یاســـا. لـــە پێنـــاو پارێزگـــاریکردن و هێنانـــەدی سیـــستمێکی پۆلیـــسی شایـــستەو کارامـــەدا، پێویـــستە لەســـەر حکومەتـــەکان کـــە دامودەزگاکـــانی جێبەجێکردنی بەو ئامرازو بنەمایانە پۆشتەو پەرداخ بکەن، هـەر لەڕێگـــەی ئـــەم دامودەزگایانەشـــەوە مەشـــق و راهێنـــان بەفەرمانبـــەرانی پـــۆلیس بکرێـــت تـــاوەکو بتـــوانن لـــە ئاســـتی جێبەجێکردنی ئەرك و کارەکانی سەرشانیاندا بن.

## تەوەری چوارەم

## بەڕێوەبردنی هەواڵدەرە نهێنییەکان

ئـەم بابەتـە بەشـێکی لاوەکیـە لـە کـارە تەکنیکییـەکانی لێکۆڵینـەوە، بـەڵام لەبەرئـەوەی چـەند بـوارێکی یاسـایی و ئـەخلاقی گـرنگ دەگرێتـە خـۆ، پێویـستە لـە دامودەزگاکـانی پـۆلیس گرنگییـەکی تایبـەتی و جیـاوازی پێبـدرێت. ئـەو زانیارییانەی کەدەست پـۆلیس دەکـەون لـە رێگـەی هەواڵـدەرە نهێنیەکانەوە سەبارەت بـە تاوانـەکان و تاوانبارەکـان، گرنگیـان زۆرە، بـەڵکو لـە هەنـدێك کاتیشدا ئـەو زانیارییانـە دەبنـە تاکـە ئـامراز کـە بەهۆیانـەوە هەنـدێك لـەتاوانباران راپێـچی دادگـا دەکـرێن، بـە تایبـەتیش ئـەو تاوانبارانـەی کـە تێـوەگلاون لـە ئەنجامــدانی تــاوانی رێکخــراودا. دەکرێــت کاریگــەری لێکۆڵەرەوەی تاوان و دەزگای پۆلیس تا ئاستێکی باش بـەهێز بکرێت لە رێگەی دانانی هەواڵدەرە نهێنیەکان و سوود وەرگـرتن لە خزمەتەکانیان بـۆ ئاسانکردنی بەڕێوەچـوونی کـاری یاسـایی دەزگاکـانی پـۆلیس. لەگـەڵ هـەموو ئەمانەشـدا ئـەم پرۆسـەیە چەندین مەترسی لێدەکەوێتەوە لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

أ- هەواڵدەرە نهێنییەکان لەزۆر کاتدا خودی خۆیان کەسی تاوانبارن، یا پەیوەندییەکی توندوتۆڵیان بە تاوانبارانەوە هەیە.

ب- بەگشتی هەواڵدەرەکان زانیارییەکانیان لەبەرامبەر پارە یان چەند داوایەکی تردا دەدەنە پۆلیس.

ج- پێکهاتن و سەوداکان لەنێوان کارمەندانی پۆلیس و هەواڵدەرە نهێنییەکاندا بەنهێنی دەکرێت.

د- لەوانەیە هەواڵدەرەکە بارودۆخەکە بقۆزێتەوە بۆ ئەوەی خۆی تاوان ئەنجامبدات و هەڵبێت.

هـ- پێدەچێت هەواڵدەر خەڵکانی تر هانبدات بۆ ئەنجامدانی تاوان لە پێناو بەدەستهێنانی پارە لەبەرامبەر پێدانی زانیاری لەسەر تاوانێك.

و- لەوانەیە هەندێك جار کارمەندی پۆلیس خۆی هەواڵدەرەکە هانبدات بۆ ئەنجامدانی تاوانێك کە دەکرێت کارمەندەکەی پۆلیس لەدواییدا ئاشکرای بکات و بیکاتە ئامرازێك بۆ سەلماندنی چست و چالاکی خۆی.

ز- لەوانەیە کارمەندی پۆلیس تێوەبگلێت لە ناشیرین بوونی ئەستۆپاکی لە رێگەی مامەڵە داراییەکانیەوە لەگەڵ هەواڵدەرە نهێنیەکەدا.

لەبەر ئەو هۆکارانەی لەسەرەوە باسمان کردن، پێویستە لەسەر دامودەزگاکانی جێبەجێکردنی یاسا چەند بنەمایەك دابڕێژن بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییەکان و مامەڵەکردنی نێوان کارمەندانی پۆلیس و هەواڵدەرە نهێنییەکان. ئەم کارەش پێویستی بە پەیڕەوکردنی ئەم هەنگاوانەی خوارەوەی هەیە:

١- دەبێت لە تەنها لە یەك کارمەندی پۆلیس ئەرکی بەرپرسیاریتی مامەڵەکردن لەگەڵ هەواڵدەری نهێنی بگرێتە ئەستۆ، واتە ئەو کەسە بە تەنها خۆی لێپرسراو دەبێت لە دروستکردنی پەیوەندی و جێبەجێکردنی هەموو کاروبارەکان لەگەڵ هەواڵدەری نهێنیدا کە هاوکاری دەزگای پۆلیس دەکات.

٢- لە کاتێکدا زۆر پێویستە ناسنامەی هەواڵدەری نهێنی ئاشکرا نەکرێت، دەبێت تۆمارێکی رەسمی هەبێت کە ناسنامەی هەواڵدەر و ئەو پۆلیسەی تیادا هۆنرابێتەوە کە بەرپرسیارە لە پەیوەندیکردن لەگەڵیدا، ئەوەش لەبەر پاراستنی گیانی پۆلیسەکەو هەواڵدەرەکە پێکەوە، دەبێت تەنها یەك کەسی دیاریکراو لە هەیکەلی فەرمانداری ناو دەزگای پۆلیس لەو تۆمارە بڕوانێت.

٣- پێویستە بەشێوەیەکی ڕێکوپێك چاودێری چالاکیەکانی هەواڵدەری نهێنی بکرێت، لەزۆر کاتیشدا نابێت هەواڵدەر

ئاگاداری پلانی تاوانێکی چاوەڕوانکراوبێت، بەڵکو لەوانەیە خۆی تێوەگلاو بێت لەو پلانەدا و لەوانەشە بەشداری لە جێبەجێکردنیدا بکات، ئەوەش مانای ئەوە دەگەیەنێت کە هەواڵدەری نهێنی دوورنییە خۆی هەڵبستێت بە ئەنجامدانی تاوانێك.

٤- ئەو چالاکیە تاوانکارییەی کە پێدەچێت رووبدات لەزۆر کاتدا مەترسیدارە و بەشدارینەکردنی هەواڵدەر لەو کارەدا زیانێکی گەورە دەگەیەنێت بەشێوەیەك ناچاردەکرێت کە بەشداری لەو چالاکیەدا بکات. لەڕاستیدا خۆدزینەوە لەهەر کارێکی بەدواداچۆنی تاوانکارییدا، بەو کارەشەوە کە هەواڵدەری نهێنی تیایدا بەشدارە، چەند کێشەیەکی یاسایی و ئەخلاقی خەتەرناك دەوروژێنێت، بۆیە دەبێت لەسەر ئاستی بەرزترین دەسەڵاتی دەزگای پۆلیس بڕیارێك لەو بارەیەوە دەربچێت، بەڵام لە دوای ئەنجامدانی گفتوگۆ و راوێژکردنی تەواو لەگەڵ دەسەڵاتی داواکاری گشتیدا، ناشبێت ئەو بڕیارو راوێژکردنانە ئەنجامبدرێت تەنها لەسەر بناغەی مامەڵەکردن لەگەڵ هەر دۆسیەیە و بەجیا نەبێت.

٥- پێویستە زیادەڕۆیی نەکرێت لە پێدانی ئەو پاداشتە داراییانەی کە دەدرێت بە هەواڵدەرانی نهێنی بەرامبەر

بەدرکاندنی زانیارییەکان، هەروەها نابێت بڕی پارەی زۆر بدرێت بۆ هاندانی هەواڵدەرەکان لە بەرامبەر پێدانی زانیارییەکانیاندا، چونکە ئەوە هۆکارێکە بۆ ئیغراکردنی هەواڵدەرەکان لەسەر هاندانی خەڵکانی تر بۆ ئەنجامدانی تاوان.

٦- زۆر پێویستە چاودێرییەکی توندو بخرێتە سەر ئەو بڕە پارەیەی کە بە هەواڵدەرە نهێنییەکان دەدرێت، ئەویش لە رێگەی گرتنەبەری چەندین رێوشوێنی گونجاو بۆ لێپێچینەوەو سەرپەرشتیکردنی ورد، چونکە ئەو کەسەی بڕیار دەردەکات پێویستی بە زانینی هەموو وردەکارییەکانی تاوان و سەرچاوەی ئەو زانیارییانە هەیە کە بەدەستیدەگات.

ڕوونکردنەوەی کۆتایی لەسەر پەیوەندی نێوان پۆلیس و هەواڵدەرە نهێنییەکان بریتییە لە ئەگەری لەکەداربوونی ئەستۆپاکی هەندێك لە فەرمانبەرانی پۆلیس لە قوناغێکی جێبەجێکردنی ئەرکەکانیدا، بەو شێوەیەش فەرمانبەرە پلەبەرزەکانی پۆلیس بەرپرسیارێتیەکی گەورە دەکەوێتە سەرشانیان، بە تایبەتی لەم بوارانەی خوارەوەدا:

١. دارشتنی سیاسەتێکی روون کە چەندین بنەما و رێوشوێنی رێکخراوو ئاراستەکراوو کارا بگرێتەخۆ بۆ هێنانەدی

گەورەترین سوود لە ڕێگەی بەدەستهێنانی زانیاریە نهێنییەکان لە بارەی تاوان و تاوانبارانەوە.

٢. دانانی ڕێوشوێنی توندو بنەمای روون بۆ ئاراستەکردن، بۆ ئەوەی فەرمانبەرانی پلە نزمی پۆلیس بە وردی لە شێوازی دروستکردنی پەیوەندییەکان لەگەڵ هەواڵدەرە نهێنییەکاندا تێبگەن، لەگەڵ چاودێریکردنی ئاستی کاریگەری ئەو پەیوەندییانە.

٣. لە راستیدا دامەزراندنی سیستمی کۆنترۆڵکردنی هەواڵدەرە نهێنییەکان بە شێوەیەکی کارا، بە هەنگاوێکی گرنگ دادەنرێت بۆ ڕێگەگرتن لە تاوان و ئاسانکاریشە بۆ ئاشکراکردنی، بۆیە تێکچوونی ئەو سیستمە دەبێتەهۆی گەندەڵبوونی فەرمانبەرانی پۆلیس و پەکخستنی سیستمی دادپەروەری جینائی و زیانیش بە رەوشی مافەکانی مرۆڤ دەگەیەنێت.

## تەوەری پێنجەم

# پۆلیس و دەسەڵاتی دەستگیرکردن

**بنەما سەرەکییەکانی:**

- هەموو تاکێك مافی ئازادی و پاراستنی کەسێتی و ئازادی هاتووچۆکردنی هەیە.
- نابێت بە زۆر کەسێك دەستگیر یان دەستبەسەر بکرێت.
- نابێت کەسێك لە ئازادییەکانی بێبەری بکرێت، تەنها لەبەر چەند هۆیەکی یاسایی و بەپێی ئەو رێوشوێنە گونجاوانە نەبێت کە لە یاساکاندا ئاماژەیان پێکراوە.
- هەر کەسێك کە دەستگیر دەکرێت، پێویستیشە لەبارەی هۆکاری دەستگیرکردنی یان دەستبەسەرکردنیەوە ئاگادار بکرێتەوە.
- ئەو کەسەی دەستگیر دەکرێت دەبێت خێرا لەبارەی هەر تۆمەتێك ئاگادار بکرێتەوە کە ئاراستەی دەکرێت.
- ئەو کەسەی بە تۆمەتێکی سزایی دەستگیر دەکرێت، ...سەر دەدرێتە دەست دەسەڵاتێکی دادوەریی.

- هەموو کەسێك کەوا دەستبەسەر دەکرێت مافی ئەوەی هەیە بدرێتە دەست دادگایەك بۆ ئەوەی ئەو دادگایە بەبێ سستی نواندن لەڕووی یاساییەوە لە هۆکاری دەستبەسەرکردنی بکۆڵێتەوە و فەرمانبدات بە ئازادکردنی لە کاتێکدا بۆی دەربکەوێت کە دەستبەسەرکردنەکەی نایاساییە.

- هەر کەسێك کە دەستبەسەر دەکرێت، مافی ئەوەی هەیە لە ماوەیەکی گونجاوو شیاودا دادگایی بکرێت یاخود ئازاد بکرێت.

- دەبێت ماوەی دەستبەسەرکردن ماوەی چاوەڕوانیکردن بێت بەر لە دادگاییکردن، ئەوەش تەنها جیاکردنەوەیەکە نەوەك بنەمایەکی گشتی.

- دەرفەت بە هەموو کەسە دەستگیرکراوەکان و دەستبەسەرکراوەکان دەدرێت پەیوەندی بکەن بە پارێزەرێك یان بە نوێنەرێکی یاساییەوە، هەروەها دەبێت دەرفەتی تەواویشیان پێبدرێت بۆ پەیوەندیکردن بەو نوێنەرە یاساییە.

- پێویستە هەموو حاڵەتێکی دەستبەسەر کردن تۆمار بکرێت و تۆمارەکەش ئەمانە بگرێتەخۆ "هۆکارەکەی، ماوەی دەستبەسەرکردن، کاتی ڕەوانەکردنی کەسە دەستگیرکراوەکە

بۆ شوێنی دەستبەسەر کردنی، کاتی ئامادەبوونی لەبەردەم دەسەڵاتێکی دادوەریدا، ناسنامەی ئەفسەرە پەیوەندیدارەکان، ئەو زانیاریانەی کە پەیوەندیدارن بە شوێنی گلدانەوە، وردەکاری لێکۆڵینەوەکان".

- دەبێت کەسی دەستبەسەرکراو یان پارێزەرەکەی لە کۆنووسی راگرتنەکە ئاگادار بکرێتەوە.

- دەبێت خێزانی کەسی دەستبەسەرکراو بەزوویی لە بارەی دەستگیرکردنی و شوێنی گلدانەوەی ئاگادار بکرێنەوە.

- نابێت هیچ کەسێك بەزۆر ناچاربکرێت بۆ شایەتیدان و دانىنان بە تۆمەتێکدا لە دژی خۆی.

- دەبێت لە کاتی پێویستدا و لەکاتی لێکۆڵینەوەدا وەرگێڕێکی خێرا بۆ کەسی دەستبەسەرکراو دابین بکرێت.

## پێوەرە نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بە دەستگیرکردن

سەرەتا پێویستە ئەوە بڵێین کە دەستگیرکردنی هەر مرۆڤێك بریتیە لە بێبەری کردنی لە ئازادییەکانی، بەڵام لە بواری جێبەجێکردنی یاسادا مەبەستەکانی دەستگیرکردن روون و ئاشکران، کە بە گشتی لەم خاڵانەدا باسیان لێوە دەکەین:

١- ڕێگەگرتن لە کەسێك کە تاوانێك ئەنجام نەدات یان بەردەوام نەبێت لەسەر ئەنجامدانی کارێکی نایاسایی و نابەجێ.

٢- ڕێگەخۆشکردن بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەیەکی پەیوەندیدار بە کارێکی نایاسایی کە کەسی دەستبەسەرکراو ئەنجامیداوە.

٣- ڕەوانەکردنی کەسێك بۆ دادگا بۆ ئەوەی لە هەر تۆمەتێك بڕوانێت کە ئاراستەی کراوە.

بە چاوپۆشین لەو ئامانجانەی لە پشت دەستگیرکردنی کەسێکەوەن، بەڵام دەبێت چەند بنەمایەکی یاسایی هەبن لەو بارەیەوە و جێبەجێکردنی دەستگیرکردنەکەش بە شێوەیەك بێت کە توانا و شارەزایی پیشەیی تێدا پەیڕەو بکرێت. ئەمە مانای ئەوەیە کە پێویستە لەسەر دەزگاکانی پۆلیس لە کاتی جێبەجێکردنی دەسەڵاتەکانیدا بۆ دەستگیرکردنی کەسێك توانا و شارەزایی پیشەیی پەیڕەو بکات.

لەو بنەما و ڕێسایانەی مافەکانی مرۆڤدا کە دەستگیرکردنی ناڕەوا و توندوتیژیان قەدەغەکردووە، پێناسەیەك نییە بۆ زاراوەی "دەستگیرکردن"، بەڵام کۆمەڵێك لەو بنەمایانە پێناسەی ئەو زاراوەیە دەکەن کە پەیوەندیدارن بە

پارێزگاریکردن له هەموو ئەو کەسانەی رووبەڕوی شێوەیەك له شێوەکانی دەستبەسەرکردن یان زیندانی کردن دەبنەوە لەژێر ناوی "زاراوە بەکارهێنراوەکان"دا. ئەوەش زۆر گرنگە بۆ فەرمانبەرانی راسپێردراو بە جێبەجێکردنی یاساکان.

## تەوەری شەشەم

# لایەنە گشتییەکانی مافی مرۆڤ و دەسەڵاتی دەستگیرکردن

### بنەما سەرەکییەکان

١- ئازادی تاکەکەسی یەکێکە لەو بنەما سەرەکی و جەوهەرییانەی کە مافەکانی مرۆڤیان لێوە بەرجەستە دەبێت، بەڵام بێبەریکردن لەم ئازادییە تاکەکەسیانە مەسەلەیەکی مەترسیدارە و هیچ پاساوێکی نیە، تەنها لە کاتێکدا نەبێت کە ئەگەر بێت و بێبەریکردنەکە پێویست و رەوا بێت. بنەماکانی ئازادی و بەیاساییکردنی و پێویستی پارێزگاری لێکردنی (٣) بنەمای سەرەکین سەرجەم حوکمەکانی پەیوەست بە مەسەلەی دەستگیرکردن دیاریدەکەن.

٢- لە یاسای نێودەوڵەتی تایبەت بە مافەکانی مرۆڤدا کۆمەڵێکی زۆر بنەمای یاسایی هەن کە مەبەستیان پارێزگاریکردنە لە ئازادی تاکەکەسی، ئەو حوکمانەش کە بە تایبەتی پەیوەندارن بە دەستگیرکردنەوە، بریتین لە دەسەڵاتی قەدەغەکردنی دەستگیرکردنی بەزۆر و ناڕەوا، هەروەها ئەو

حوکمانـەش کـە ڕێوشـوێنەکان دیاردەکـەن پێویـستە لـەکاتی دەستگیرکردنی کەسێکدا بەتەواوەتی کاریان پێبکرێت. هەروەها چـەند حـوکمێکی تـریش هـەن تـەنها پەیوەنـدارن بـە حاڵـەتی دەستگیرکردنی نەوجەوانان، لەگەڵ ئـەو حوکمانـەی کـە پێـدانی قەرەبووکردنـــەوە بـــۆ قوربانیـــانی دەســـتگیرکردنی نایاســـایی دەسەپێنن.

## ڕێگەگرتن لە دەستگیرکردنی ستەمکارانە:

- حـوکمی ڕێگـەگرتن لـە دەسـتگیرکردنی سـتەمکارانە لـە دەقی ماددەی(٩)ی جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مـرۆڤ دا باسـی لێوەکراوە کە دەڵێت" نابێت هیچ مرۆڤێك بەشێوەیەکی نـاڕەواو ستەمکارانە دەستگیر بکرێت یان دەستبەسەر بکرێت ".
- هـــەروەها برگـــەی(١) لـــەماددەی(٩)ی پەیماننامـــەی نێودەوڵـەتی تایبـەت بـە مافـە مـەدەنی و سیاسـیەکان باسـی ڕێگـەگرتن لـە دەسـتگیرکردنی سـتەمکارانە دەکـات، دەڵێـت" هەموو تاکێك مافی ئازادی و پاراستنی کەسیەتی هەیـە و نابێـت بـــەزۆر و بـــە جـــۆرێکی ســـتەمکارانە دەســـتگیربکرێت، یـــان دەستبەسەر بکرێت، هەروەها ناشبێت کەسێك لـە ئازادییـەکانی

بێبەری بکرێت، تەنها لەسەر بناغەی هۆکارو لە چوارچێوەی یاساو ئەو ڕێوشوێنانەدا نەبێت کە یاسا بڕیاریان لێدەدات".

- قەدەغەکردن و ڕێگەگرتن لە دەستگیرکردنی ستەمکارانە لەماددەی (٦)ی میساقی ئەفریقی بۆ مافەکانی مرۆڤ و گەلان و ماددەی(٧)ی ڕێکەوتننامەی ئەمریکی بۆ مافەکانی مرۆڤ و ماددەی(٥)ی ڕێکەوتننامەی ئەوروپی بۆ مافەکانی مرۆڤ باسی لێوەکراوە، هەر دەقێك لەم دەقانەش بریتیە لە ڕاگەیاندنی مافی تاك لە بەدەستهێنانی ئازادی و ئاسایشی تاکەکەسیدا و گەڕانەوەی دامودەزگاکان بۆ بناغە یاساییەکان لەکاتی بەکارهێنانی دەسەڵاتی دەستگیرکردندا.

ئەو ڕێوشوێنانەی پێویستن لە کاتی دەستگیرکردندا بگیرێنەبەر:

ئەو ڕێوشوێنانەی کە پێویستە لە کاتی پەیڕەوکردنی دەسەڵاتی دەستگیرکردندا بگیرێنەبەر لە هەردوو بڕگەی (٢) و (٣) ی ماددەی (٩) ی ڕێککەوتننامەی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکاندا هاتووە کە دەڵێت:

١- پێویسته هەر کەسێك لە کاتی راگرتنیدا لە بارەی هۆی راگرتنەکەیەوە ئاگادار بکرێتەوە، هەروەك دەشبێت زۆر بە خێرایی لە بارەی هەر تۆمەتێکەوە ئاگادار بکرێتەوە کە ئاراستەی دەکرێت.

٢- کەسی راگیراو یان دەستگیرکراو بە تۆمەتێکی سزایی دەبێت بە خێرایی و بێ دواکەوتن رەوانەی یەکێك لە دادوەرەکان یان یەکێك لەو فەرمانبەرە یاساییانە بکرێت کە رێگەپێدراون بە کارکردن لە کاروبارە یاساییەکاندا.

٣- چوار بنەمای گشتی لەو کۆمەڵە بنەمایانەدا هەن کە پەیوەندیدارن بە پارێزگاریکردن لە هەموو ئەو کەسانەی کە رووبەرووی شێوەیەك لە شێوەکانی راگرتن یان بەندکردن دەبنەوە، ئەو بنەمایانەش ئەمانەن:

بنەمای(١): نابێت کەسێك دەستگیر بکرێت تەنها بە پێی یاساو بەدەستی کەسانی تایبەتمەند یان کەسانی رێگەپێدراو نەبێت.

بنەمای(٢): هەرکەسێك کە دەستگیر دەکرێت لەکاتی دەستگیرکردنیدا هۆی دەستگیرکردنی پێڕادەگەیەنرێت،

هەروەك دەشبێت بە خێرایی ئەو تۆمەتەی پێرابگەیەنرێت کە ئاراستەی کراوە.

بنەمای(٣): لەکاتی دەستگیرکردن و راپێچکردنی کەسێکدا بۆ شوێنی راگرتنی یان بردنی بۆ بەردەم دادگایەك یان دەسەڵاتێکی دادوەری، پێویستە هۆکارەکانی دەستگیرکردن و هەموو زانیارییە وردو پەیوەندیدارەکان بە شوێنی راگرتنی تۆماربکرێت.

بنەمای(٤): ئەو کەسانەی کەوا دەستگیر دەکرێن زانیارییان پێدەدرێت دەربارەی مافەکانیان و روونکردنەوەی ئەو مافانە و چۆنیەتی بەکارهێنانیان.